# گزنگێکی تر

نووسینی: **مریەم سەفایی**
لە فارسییەوە: **دڵشاد کەریم**

**سەرچاوە:**

**طلوعی دیگر**
**مریم صفائی**
**انتشارات عصر جدید- دارمشتات ألمان**
**چاپ اول پائیز ١٣٨٦ ه ش - بازبینی شده پائیز ١٣٨٧**


* ناوی کتێب: گزنگێکی تر

* نووسینی: مریەم سەفایی

* لە فارسییەوە: دڵشاد کەریم

* چاپ: چاپخانەی ئاراس

* ژمارەی سپاردن (١٦٨٥)ی ساڵی ٢٠٠٩

# پێڕست

# له جیاتی پێشەکی

چاوێك بە ژیانی ئەمڕۆماندا دەخشێنین و ئاوڕێكیش بۆ ڕابردوومان دەدەینەوە، ئەو سەردەمەی كە لە ئەشكەوتەكان دەژیاین و لەسەر دیوارەكان وێنەمان دەكێشا (واتە دەماننوسی). خۆر هەڵدەهات و ئێمەش لە ڕوناكی و گەرماییەكەیدا گەشەمان دەكرد ... و ئاوا دەبوو تا بەرەبەیانی ڕۆژی دواتر ....

سەیرێكی ئەمڕۆمان دەكەین و سەیرێكی منداڵیی، ئەو كاتانەی كە دەگریاین و داوای شیرمان دەكرد و گاگۆڵكێمان بوو ... فێری پێكەنین و ناسین و ڕۆیشتن دەبووین ... كەمكەم گەشەمان كرد تا گەیشتینە ئەمڕۆ. خۆر هەڵدەهات و ئێمەش لە پرشنگ و گەرمایی ئەودا گەشەمان دەكرد... ئاوادەبوو تا ڕۆژی دواتر ...

سەیرێكی بەهار دەكەین، وەرزی سەوزیی و ڕوان و نوێبوونەوە، سەردەمێك كە هەر شتێك لە هەرجێگەیەكدا كە هەبوو دەڕوێت. سەردەمێك هاوینە و هەر شتێك كە ڕواوە ... بەرووبوومی دەبێت ... و پاییز و زستان، كە ئیتر نە تەڕی دەمێنێت و نە ڕووان و نە سەوزایی.. و خۆریش هەر تیشكی خۆی دەدات.

جیهانی مرۆڤایەتی وەكو پەیكەری مرۆڤە. سەردەمی ئەشەكەوتنشینی سەردەمی منداڵی ئەوە، ئەمڕۆ سەردەمی نەوجەوانییەتی، قۆناغ بە قۆناغ گەشەی كردوە تا گەیشتوەتە ئەمڕۆكە.

ئەگەر لاپەڕە ڕوناكەكانی مێژوو هەڵبدەینەوە و بەدوای هۆكاری سەرەكی پێشكەوتن و گەشەكردنی هەر قۆناغێك بگەڕێین، كەسانی بەرجەستە

دەبینین کە لە سەردەمی جۆراوجۆردا وەدیار کەوتوون، پەڕیوەنەتەوە ئەوبەری بیروبۆچوونی سەردەمی خۆیان، ئەو ڕاستی و نهێنیانەی ئاشکرا کردوە کە ئەو کات شاراوە بوون.

پێشکەوتنی جیهانی مرۆڤایەتی بە پلەی یەکەم قەرزاری پێغەمبەر، دۆزەرەوە، داهێنەر و بلیمەتەکانە. لەنێوان ئەم کەسانەدا، کەسانی پیرۆز لە ئایینەکان وەدیارکەوتوون، وەکو خۆر دەدرەوشێنەوە. کاتێ کە بە چاوی ویژدان سەیری دەکەین، دەبینین کە بە درێژایی مێژوو، هەرکاتێك بەهاری ژیانی مرۆڤ ڕوودەکاتە دواکەوتن و داڕووخان، ئەخلاقی گشتی فەساد دەبێت و زستانی زوڵم و نایەکسانی و کینە و نەفرەت هەموو شوێنێك دەگرێتەوە، ئەوکاتە پێغەمبەرێك کە بوونی سەرسوڕهێنەر و نهێنی ئامێزە، بە هێزێکی سەرووتر لە هێزی مرۆڤ لە نێوان ئافەریدەکان دەردەکەوێت. ئەو وەکو کەسێکی چاوتیژ لە نێوان کەسانی نابینا هەڵدەستێت و پەیامی خودا ڕادەگەیەنێت. ئەو هەڵاتنی خۆرە دوای تاریکی شەو لە سپێدەیەکدا، بەهارێکە لە دوای سەرمای زستان. ئەو کەسەی کە وەکو ئاوێنە ئیرادەی خودا دەداتەوە بەسەر ئەم جیهانەدا، پێی دەڵێن (دەرکەوتە پیرۆزەکان) (مەزهەرە پیرۆزەکان).

لە هەر سەردەمێکدا، یەکێك لە (مەزهەرە پیرۆزەکان) دەرکەوتوون و وەکو خۆر بیرە تاریکەکانیان ڕووناك کردوەتەوە و خەڵکی نووستوویان لەخەو هەڵساندوە.

حەزرەتی کرێشنا، حەزرەتی مووسا، حەزرەتی زەردەشت، حەزرەتی عیسا و حەزرەتی محەمەد کە بە دووری چەند سەدەیەك لە یەکتر پێیان خستۆتە ئەم جیهانە، بوون بە هۆکاری گەورەی پێشکەوتن و گەشەی جۆری مرۆڤ.

هەموو ئەو (مەزهەرە پیرۆزانە) ئەوە ڕادەگەینن کە قسەکانیان هی خۆیان نییە، بەڵکو ئەو شتەی کە دەیڵێن، بە هۆی سروشی خواوە بۆیان هاتۆتە خوارەوە و ئەوان تەنیا هەڵگری ئەو قسانەن.

مژدەیەك کە لە تەواوی کتێب و نیشانەکانی ئەو مەزهەرانە یەکسانە: مژدەی ڕاهێنەرێکی مەزن، کەسێك کە دێت تا حکومەتی ئاشتی و یەکسانی لەسەر زەوی بەرقەرار بکات و هەموو جۆرێکی مرۆڤ لە ژن و پیاو و نەژاد و گەلێك بکاتە یەك خێزان. گومانی تێدا نییە کە دەرکەوتنی ئەم ڕاهێنەرە مەزنەی جیهانی مرۆڤایەتی، بە گەورەترین ڕووداوی مێژوویی دەژمێردرێت.

ئێستاکە بەهاییەکان مژدەی ئەوەیان داوەتە جیهانی مرۆڤایەتی کە ئەو ڕاهێنەرە مەزنە وەدیارکەوتووە، نیشانە و بەڵگە و ڕێنماییەکانی ئاشکرایە و هەر داواکەرێکی ڕاستی دەتوانێت بە ئاسانی دەستی بکەوێت و بیری لێبکاتەوە و تێیدا قووڵ ببێتەوە و تێبگات کە خۆری حەقیقەت دوای شەوەڕەشێك، دیسان هەڵاتوەتەوە و بەهاری رووحانیەکی تر دوای زستانێکی تر لەنوێوە درەوشاوەتەوە.

ئەوەی لە دەروازەی یەکەمدا دەیخوێنینەوە، کورتەمێژووی ژیانی حەزرەتی بەهائوڵلا، مەزهەری پیرۆزی خوداییە لەم سەردەمەدا. لەتەنیشت ئەویشدا دەیخوێنینەوە کە چۆن حەزرەتی باب بە ماوەیەکی زۆر کورت پێش دەرکەوتنی حەزرەتی بەهائوڵلا نێردرا تا دڵە سافەکان ئامادە بکات بۆ پێشوازی و قەبوڵکردنی حەزرەتی بەهائوڵلا. لە دەروازەی دووەمدا لەگەڵ بەشێك لە ڕێنماییەکانی ئاینی بەهایی ئاشنا دەبین. لە دەروازەی سێیەمیشدا گوڵبژێرێك لە نووسینەکانی بەهایی لەبارەی بابەتی جۆراوجۆرەوە دەخوێنینەوە.

## بەشی یەکەم

# لەدایکبوون و منداڵی حەزرەتی بەهائوڵڵا

لە بەرەبەیانی ڕۆژێکی پاییزی، ١١٩٦/٨/٢٢ کۆچی هەتاوی، بەرانبەر (١٨١٧/١١/١٢ی زاینی) لە ماڵی میرزا عەباس نووری، منداڵێك چاوی هەڵێنا کە موقەدەر بوو کاریگەری بخاتە سەر ژیانی ملیۆنەها کەس بە درێژایی مێژوو. ناویان لێنا حسێنعەلی.

لە هەمان ڕۆژەکانی لەدایکبوونیەوە، دایك و باوك زۆر سەریان سوڕما کە بینیان کۆرپەکەیان وەکو منداڵەکانی تر ناگرییێت. باوك گوتی: ئەم کوڕە لە نێوان هەموو کوڕەکانی تر باشترینیانە، دایکیش شانازی کرد بە هەبوونی کوڕێکی ئاوها.

چەند ساڵێك دواتر، میرزا عەباسی وەزیر لەخەو ڕاپەڕی. هەڵسا و لە شوێنی خۆیدا دانیشت. ئارەقەی سەر تەوێڵی پاك کردەوە و کەوتە بیرکردنەوە لەو خەونەی کە بینیبووی:

کوڕەکەی لە باخێکدا خەریکی گەڕان بوو. هەموو باڵندەکان لە دەوروبەری سەریدا دەفڕین و دەیانەویست زیانی پێ بگەینن، بەڵام نەیاندەتوانی. دواتر بینی کە لە دەریایەکی بێ کەنار خەریکی مەلەوانییە. جەستە

بچوکەکەی وەها دەدرەوشایەوە کە تەواوی دەریاکەی ڕووناك کردبوەوە. کەزییە ڕەشەکانی لە دەوروبەریدا بەسەر ئاوەکەوە تاڵ تاڵ ببوون، هەر تاڵێك لە قژەکەی ماسییەك بە لێوی گرتبووی، ماسییەکان لە ڕووناکی ڕوخساری ئەبلەق مابوون. بەهەر لایەك کە کوڕەکە مەلەوانی دەکرد، هەموو ماسییەکانیش بەرەو ئەولا دەڕۆیشتن، بەڵام هیچ ئازارێك بە منداڵەکە نەدەگەیشت ...

بە پەلە، خەوناسێکی بەناوبانگی بانگکرد بۆ لێکدانەوەی خەونەکەی. لێکدەرەوەی خەونەکە، وەك بڵێی مەزنی داهاتووی منداڵەکەی بە ئیلهام بۆ هاتبێ گوتی:

ئەو باخ و دەریا بێکەنارەی کە بینیوتە، بە مانای بەرفراوانی ئەم جیهانەیە و باڵندە و ماسییەکان، خەڵکانی ئەم جیهانە. لەو منداڵەی ئێوە لە داهاتوودا، فەرمانێك وەدیاردەکەوێت کە زۆرکەس دوژمنداریەتی دەکەن و هێرشی دەکەنە سەر. بەڵام ئەو هەر بەتەنیا سەردەکەوێت بەسەر هەموویاندا و پشتیوانی خودا دەیپارێزێت لە هەر ئازار و ناخۆشییەك.

ئەوکاتە حسێنعەلی شەش ساڵان بوو.

میرزا حسێنعەلی فێرکردنی سەرەتایی لەماڵدا خوێند، بەڵام هیچ کات نەچوە قوتابخانە. ئەو لە هۆش و زیرەکی و خێرخوازی و چاکەکاری، وێردی سەر زمانی خەڵك بوو. کاتێ کە گەیشتە تەمەنی چواردە ساڵ، لە تێگەیشتنی بابەتە رووحانی و زانستی و دەستکراوەیی و خۆشەویستیش ناسرا لای هەمووکەس. هەمیشە خەریکی یارمەتی هەژار و نەداران بوو.

## بەشی دووەم

# مژدەی دەرکەوتن

ڕۆژی (٢٢ی مانگی ئایاری١٨٤٤)، چەند سعاتێك دوای خۆرئاوابوون، شیراز ڕووداوێکی مەزن و سەیری بەخۆوە بینی.

لەو دوای نیوەڕۆ بەهارییەدا، لاوێکی بازرگان، خانەخوێی میوانێکی ماندوو بوو کە لەگەڵ هاوڕێیەکانی خۆی هاتبووە شیراز، ئەم لاوە کەسێك نەبوو جگە لە حەزرەتی باب.

مەلا حسێن، ئەو ڕێبوارەی تازە گەیشتبووە شیراز، کە لە قوتابیانی قوتابخانەی شەیخییە بوو، مانگی ڕابردوو کاتێ کە گەیشتە کەربەلا، زۆر خەمبار بوو بە بیستنی هەواڵی وەفاتی مامۆستاکەی. بەڵام دوایین وەسیەتی مامۆستای خوالێخۆشبوو هێزێکی تازەی پێبەخشی:

ڕاپەڕن و بەدوای خۆشەویستدا بگەڕێن. هەڵبەتە کە دەیدۆزیەوە.

ئەویش بە بێ ڕاوەستان کەوتبوە گەڕان بەدوای خۆشەویست. هێزێکی شاراوە کێشابووی بەرەو ئێران.

ئێستاش دوای چەندین مانگ، بە شەوقی دۆزینەوەی خۆشەویستی

ڕاستەقینە، هاتبوە شیراز. هاوڕێکانی کە هاوپۆلەکانی ئەویش بوون و لەو سەفەرە رووحانیەدا ببوە هاوپەیمانیان و لە مزگەوتێك لەناوشاردا نیشتەجێ ببوون و ئەو بۆ گەڕان هاتبوە دەرەوەی شار.

گەنجە بازرگانەکە شاڵێکی سەوزی لە پشت بوو و عەمامەیەکی ڕەشی بەسەرەوە بوو، بانگهێشتی کرد بۆماڵەکەی خۆی. موسافیر نەیناسی، بەڵام ڕەفتارە جوان و گوفتارە شیرینەکەی هێندە کاریتێکرد کە خۆشی نەیزانی چۆن بانگهێشتەکەی قەبوڵکرد.

چەند سەعاتێك دواتر، ئەو دووە لە باڵەخانەی ماڵی بازرگانە لاوەکە خەریکی گفتوگۆ بوون. مەلا حسێن دواتر بەسەرهاتی ئەو شەوەی گێڕایەوە و گوتی کاتێ کە لاوەکە پرسیاری یەکەبەیەکەی نیشانەکانی حەزرەتی مەهدی لێکرد کە هەموو چاوەڕوانی دەرکەوتنیان دەکرد، ئەو بەڕێزە چەند ساتێك بێدەنگ بوون و ئەوکاتە بە دەنگێکی زۆر مەتینەوە فەرموویان: سەیرکە، ئەو نیشانانەی کە گوتت لەمندا دەبینی؟ دواتر یەکبەیەك نیشانەکانی باسکرد و لەگەڵ خۆی بەراوردی کرد.

مەلا حسێن لە سەرەتای ئەو قسانە تووشی دڵەڕاوکێیەکی زۆر و نیگەران بوو. ئەو لە شەوقی چاوەڕوانی خۆشەویست، تەمەنێکی ڕابوردبوو و لە کۆتاییدا، بە هەزاران ئومێد هاتبووە ئەو شارە، رەنگە بیدۆزێتەوە ....
ئێستاش لاوی بازرگان، خۆی وەکو ئەو خۆشەویستە ڕاستەقینەیە ناساند. ئەو لەگەڵ ئەوەی کە تەواوی نیشانەکانی لەو لاوەدا دەبینی، بەو ئاسانییە نەیدەتوانی ئەوە قەبوڵ بکات.

ویستی نارەزایی دەربېڕێت، بەڵام هەرزوو هاتەوە هۆش خۆی و پەیمانی بەخۆی دا ئەگەر جارێکی تر، خاوەن ماڵ بانگەشەی مەهدی بوونی خۆی دووبارە بکاتەوە، ویژدان لە دەست نەدات.

دوو سعات و یانزە خولەك لە شەو ڕایبوردبوو کە ئەو هەستی بە نهێنییەکە کرد. خۆشەویستی ڕاستەقینیەی ناسی و سەری نەوازشی دانەواند.

خاوەنماڵ، دوای ئەوەی بە بەڵگەی بەرجەستە، بەو مێوانە باش و تامەزرۆیە، پایەی خۆی وەدیارخست، هەر ئەو سعاتە بە خێراییەکی زۆرەوە یەکەمین تەفسیری سورەتی یوسفی دابەزاند. ئەوکاتە وەهای بەمەلا حسێن گوت:

تۆ یەکەمین کەسی کە باوەڕت بە من هێناوە. من (باب اللە)م و تۆش (باب الباب) دەبێ هەژدە کەس باوەڕ بەمن بهێنن، بێ ئەوەی کەس باسی منیان بۆ بکات. واتە خۆیان من بناسن و باوەڕ بهێنن... ئەوەی تۆ ئەمشەو هەستت پێکرد لە هەموو ئەوانی تر و هاوڕێکانت بیشارەوە.

دواتر، مەلا حسێن کاریگەری وەدیارکەوتنی حەزرەتی بابی لە رووح و رەوانی خۆیدا بەم شێوەیە دەربڕی:

پێش ناسینی فەرمانی خودا چەند لاواز و بێتوانا بووم و تا چ ڕادەیەك بیم و ترسم لە خۆمدا دروستکردبوو. نە دەمتوانی هیچ شتێك بنووسم و نە دەمتوانی بەرێدا بڕۆم. دەست و پێم بەردەوام دەلەرزی. بەڵام دوای ناسینی حەزرەتی باب و ناسینی مەزهەری فەرمانی خودا، لە جیاتی جەهل، زانست و زانیاری خودایی لە جیاتی لاوازی، هێز و توانایەکی

سەیر لە بوونمدا دروستبوو. بە شێوەیەك كە خودام بە خاوەنی توانایەكی بێئەندازە دەبینی و یەقین بووم كە ئەگەر تەواوی دونیا و خەڵكی جیهان لە دژم ڕاوەستێت، بەتەنیا بەسەر هەموویاندا زاڵ دەبم. جیهان و ئەوەی تێیدایە لە دەستمدا وەكو مشتێك خۆڵ خۆی نیشان دەدا. دەنگی جبرائیلم دەبیست كەبە خەڵكی جیهانی دەگوت: ئەی خەڵكی جیهان، لەخەو هەڵسن، چونكە بەرەبەیانی ڕوناك هاتووە، هەڵسن و سود لە ڕەحمەت و خۆشی وەدیاركەوتن و بەرەكەتی فەرمانی خودا وەرگرن. باب ڕەحمەتی خودایە. ئەی خەڵكی جیهان، هەمووتان بڕۆنە ژوورەوە. چونكە ئەو كەسەی كە چاوەڕوانی بوون وەدیار كەوت، ئەو بە ئاشكرا بانگهێشتتان دەكات بۆ خوانی بەیەكگەیشتن.

## بەشی سێیەم

# ڕاسپاردەی مەزن

چەند مانگێك دوای ئەوە، مەلا حسێن بە ڕستێك ئایەتی خودایی بەرەو تاران کەوتەڕێ. لاوێك لە تاران چاوەڕوانی ئەو بوو. ئەو لاوە کەسێك نەبوو جگە لە میرزا حسێنعەلی نووری کە تازە ژنی هێنابوو و لە ماڵێك کە شایستەی بەگزادەیەکە، دەژیا. ئەو بەگزادە لاوە، لەگەڵ ئەوەی حەزی لە دەربار و وەزارەت نەبوو، بێ کۆتایی جێگەی ڕێز و خۆشەویستی میر و بەگزادەکان بوو. کەسایەتییەکی سەرنجڕاکێشی هەبوو کە هەر کەسێك یەك جار لەگەڵی دانیشتبایە یان تەنانەت قسەیەکیشی لێ ببیستبایە، خۆشی دەویست.

مەلا حسێن لە چەندین شار و لادێدا تێپەڕی تا گەیشتە تاران. لەوێ لە ژوورێکی قوتابخانەیەکی ئاینی نیشتەجێ بوو. وشەکانی حەزرەتی بابی بەردەوام لە مێشکدا دەزرینگایەوە و پێی دڵخۆش دەبوو.

لە خاکی تاراندا نهێنییەك هەیە و ڕازێك شاردراوەتەوە، کە ئەگەر وەدیار بکەوێت، جیهان دەبێتە بەهەشتێکی بەرین. هیوادارم تۆ بە باشی و گەورەیی خۆت بەو خۆشەویستە بگەیت.

لە دڵەوە ئارەزووی ئەوەبوو کە بە زوویی هەست بەو نهێنییە بکەیت.

مەلا حسێن لە هەمان ساتی بەڕێکەوتنی لە شیرازەوە، ئامۆژگاریەکانی خۆشەویستەکەی لەبەرچاو بوو:

تۆ دەبێ دامێنی هیمەت لە پشتێن ببەستی و دەست بە بڵاوکردنەوەی فەرمانی خودا بکەیت. خودا دەتپارێزێت ... هەر بەو شێوەیەی کە باران زەوی سەوز دەکات، تۆش بە بارانی بەرەکەتەکانی خۆت کە خودا بەخشیویەتی پێت، خەڵك سەوز دەکەیت.

لەمڕووەوە بەهەر شارێکدا تێدەپەڕی وەکو باران دەباری و تۆوە شاراوەکەی ناو دڵانی سەوز دەکرد. بە هەواڵە دڵخۆشکەرەکانی ئەو چ کوریکەیەك کە لە دڵەکان ڕواو چ گوڵێك کە لە دڵان دەربوو چ گوڵزارەکانی کە لە جیهانی رووحەکان وەدیارکەوت.

مەلا حسێن کاتێ کە لەو قوتابخانە ئاینییە نیشتەجێ بوو دانەنیشت. یەکەمین کەسێك کە کەوتە بیری و دەبایە وشەی خودای پێگەیاندبوایە، کۆنە هاوڕێکەی بوو، واتە مامۆستای ئەوێ. ئەو مەلا حسێنی بە زانایەکی بێوێنە دەزانی و ڕێزی لێدەگرت. بەڵام لە بیستنی قسەکانی سەری سوڕما. مامۆستاکەی وەها تەسەوری دەکرد کە مەلا حسێن ببێتە جێنشینی مامۆستاکەیان، سەید کازم ڕەشتی، بەڵام لەوەی کە دەیبینی مەلا حسێن بیرێکی نوێی بۆ شیدەکاتەوە، سەری سوڕما. قسەکانی مەلا حسێن لە دەربڕینی ڕاستی وەدیارکەوتنی نوێدا هیچ کاریگەرییەکی لەسەر کۆنەهاوڕێکەی نەبوو. لە ڕاستیدا، ئەو دەروازەکانی دڵی خۆی

بەڕووی وشەکانی خودا بەست و کێڵگەی دڵی خۆی لە بارانی ڕەحمەتی خودا بێبەش کرد.

مەلا حسێن لەگەڵ ئەوەی ڕاسپێردراوەکەی خۆی جێبەجێ دەکرد و سەرنجی ئەوەی نەدەدا کە کێ فەرمانی خودا قەبوڵ دەکات یان نایکات، لەگەڵ ئەوەش کاتێ کەسێ قەبوڵی دەکرد زۆر دڵخۆش دەبوو.

ڕێك لەوکاتەی کە ئەو دووە خەریکی قسەکردن بوو، گەنجێك لە حوجرەکەی تەنیشتیان دەنگی ئەوانی دەبیست. مەلا حسێن وشەکانی خودای بە نەرمی دەخوێندەوە و گەنجەکە بە باشی هەستی دەکرد کە مامۆستا بە بێویژدانییەکی تەواوەوە، گفتوگۆ دەکات و نایەوێت بچێتە ژێرباری وشەی حەق. ئەو هەمیشە مامۆستاکەی خۆشدەویست و ڕێزێکی زۆری دەگرت. بەڵام ئێستاکە کەمکەم هەموو شتێك لە ڕوانگەی گەنجەکە دەگۆڕا، زیرەکی و توانای مامۆستا لە ڕوانگەی گەنجەکە تێکشکا !....

کاتێ کە مامۆستای قوتابخانە بە مەلا حسێنی گوت کە مانەوەی تۆ لە تاران لە بەرژەوەندیدا نییە و ئابڕووی هەموان دەبەیت، گەنجەکە نیگەران بوو. ئەو دەیەویست ئازادانە بچێتەلای میوانەکە و لە هەموو شتێك بپرسێت. کاتێ کە مەلا حسێن گوتی ماوەیەکی زۆر لە تاران نامێنێتەوە، پتر دڵتەنگ بوو. ئارەزووی دەکرد کە میوانەکە هێندە لە تاران بمێنێتەوە تا تێری بکات لە کانیاوی ژیان....

بەیانی ڕۆژی دواتر، مەلا حسێن پێش خۆرهەڵات لە قوتابخانە دەرچوو تا نیوەشەو نەگەڕایەوە. گەنجەکە تا دوێنێ موریدی مامۆستاکەی بوو

ستایشی ئەوی دەکرد، ئەمڕۆ، ماندوو و دڵتەنگ لە رەفتاری شەوی ڕابردووی ئەو، چاوەڕوانی گەڕانەوەی میوان بوو. گەنجەکە لەگەڵ ئەوەی کە عەشقی ئەو شۆر و سەرنجڕاکێشی و قسە زانیارییە قووڵەکانی مەلا حسێن ببوو، لە بەرانبەر رەفتاری ناشایستەی مامۆستاکەی هەستی بە توڕەبوونێکی زۆر دەکرد.

تامەزرۆی دیدار، وایلێکرد کە نیوەشەو جەسارەتی ئەوە بکات و بە هێمنی تەقە لە دەرگای حوجرە هەڵسێنێت. دەنگێك فەرمووی لێکردە ژوورەوە.

چووە ژوورەوە. لە یەکەمین ساتی چوونەوەناوەوە، هەستی کرد کەوتۆتە ژێر کاریگەری هێزێکی مەزن. مەلا حسێن لە شوێنی خۆی هەڵسا و بەخێرهاتنی لێکرد. هەڵسوکەوتی هێندە میهرەبان و خۆشەویستانە بوو کە گەنجەکە هەستی بە نامۆیی نەکرد. لە تەنیشتی دانیشت و ئەوەی لە دڵیدا بوو دەریبڕی. لە کاتی قسەکردن بەردەوام فرمێسکی دەباراند. گوتی کە تەواوی قسەکانی دوێنێ شەوی بیستوە و لە بێویژدانی مامۆستاکەشی دڵتەنگ بووە. گوتی لە هەواڵی دەرکەوتنی رۆژی خودا، هێندە خۆشحاڵ بووە کە شەو نەخەوتوە و چرکەی ژماردوە تا ئەم دیدارە. گوتی ئارەزووی هەیە لە خزمەتی ئەودا بێت.

مەلا حسێن گوتی: ئێستا دەزانم بۆ ئەو قوتابخانەیەم بۆ نیشتەجێبوونی خۆم هەڵبژاردووە. مامۆستاکەی تۆ بە تەواوی غرورەوە پەیامی خودای رەت کردەوەو بێڕێزی بە خاوەنەکەی کرد، بەڵام ئومێدەوارم کە شاگرد،

بە پێچەوانەی مامۆستا، درک بە ڕاستییەکان بکات.

دواتر پرسی: ناوت چییە و خەڵکی کوێیت؟

گەنجەکە گوتی: ناوم مەلا محەمەدە و نازناوم مامۆستایە و خەڵکی شارۆچکەی (نوور)ی سەر بە مازەندەرانم.

مەلا حسێن تا ناوی نووری بیست لە زمانی گەنجەکە، چاوی بریسکەی دایەوەو بە تامەزرۆییەوە پرسی:

ئایا لە نێوان ئەندامانی خێزانی وەزیری خوالێخۆشبوو، میرزا عەباس بزورگ نووری، کەسێك هەیە لەوانی تر باشتر بێت؟

گەنجەکە هەموو ئەندامانی نووری دەناسی. تا ناوی میرزا بزورگی نووری باسدەکرا، تەنیا یەك ناو لە مێشکی هەموو ئەو کەسانەی کە ئەو خێزانەیان دەناسی، گوزەری دەکرد.

- بەڵی، لە نێوان کوڕانی وەزیر، یەکێك هەیە کە تایبەتمەندی باوکی هەیە و لە ڕێکوپێکی و باوەڕداری و نەرمونیانی بێوێنەیە.

- کاری چییە؟

- کاری ئەوەیە دڵی ئەو کەسانەوە دەداتەوە کە دڵڕەنجاون و دەستی هەژاران دەگرێت. ئیشێکی تری نییە.

- پلە و پایەی چییە؟

- (یار)ی هەژاران هاوڕێی بێکەسان. پلە و پایەی هەر ئەوەیە.

- مەلا حسێن بە شەوقەوە پرسی: ناوی چییە؟

- حسێنعەلی.

- لە کام لە خەتە خۆشەکانی باوکیدا وەستایە؟

- خەتی شکەستە و نەستەعلیق زۆر جوان دەنوسێت.

- مەلا حسێن هەر پرسیارێکی دەکرد و هەر وەڵامێکی دەبیست، پتر دڵخۆش دەبوو، بە شادمانییەوە پرسی:

- کاتەکانی خۆی چۆن بەڕێدەکات؟

- بە پیاسە و سەردانی دارستان و بێشەکان. حەزی لە سروشتە.

- تەمەنی چەندە؟

- بیست و هەشت ساڵ.

مەلا محەمەد واقوڕمابوو لەو پرسیارانەی کە بە دوای یەکدا لێی دەپرسرا، تێنەدەگەیشت کە بۆ ئەو میوانە، هێندە تامەزرۆی هەواڵی کوڕە وەزیرە. ئێستا ئیتر دەموچاوی مەلا حسێن لە شادی و خۆشحاڵییەوە دەدرەوشایەوە، گوتی:

پێموایە زۆر دەچیە سەردانی، وایە؟

گەنجەکە گوتی: زۆرجار دەچمە ماڵیان.

- ئایا دەکرێ ئەمانەتێك لە منەوە بە دەستی ئەو بگەیەنیت؟

- بە خۆشحاڵییەوە.

مەلا حسێن ئەو نووسینەی کە لە قوماشێکی نەرمی پێچاوبوەوە، دایە دەست گەنجەکەو گوتی:

بەرەبەیان ئەمەی بە دەست بگەینە و هەر شتێکی وەڵام دایەوە پێم بلێوە.

چەند سعاتێك پتر نەمابوو تا بەرەبەیان، گەنجەکە ڕوخسەتی ڕۆیشتنی وەرگرت. مەلا حسێن تا بەر دەرگا بەڕێیکرد.

گەنجەکە، بە گوێرەی ئەو بەڵێنەی کە دابووی، لەکاتی بەرەبەیاندا بە ئەمانەتە بەهادارەکەیەوە لە ماڵ دەرکەوت. ماڵی میرزا حسێنعەلی زۆر دوور نەبوو. کاتێ کە گەیشتە ماڵی کوڕە وەزیر، سەری سوڕما لە بینینی میرزا مووسای برا بچوکەکەی میرزا حسێنعەلی لە بەردەرگای ماڵ. وەك بڵێی چاوەڕوانی دەکرد. گەنجەکە گوتی کە هەڵگری ئەمانەتێکە بۆ جەنابی میرزا حسێنعەلی. میرزا مووسا بە تەنیایی چووە ژورەوە و دوای چەند ساتێك گەڕایەوە، ئەمجارە هەردووکیان پێکەوە چوونە ژوورەوە.

هەرجارەی گەنجەکە (ئەوی) دەبینی، خۆی لە جیهانێکی تر دەبینییەوە. جیهانێك کە زۆر جیاوازی هەبوو لەگەڵ ئەم جیهانەدا، جیهانێك کە تەنیا شادی و ڕووناکی بوو. ئەمانەتەکەی دایە دەست میرزا مووسا تا پێشکەشی ئەو بەڕێزەی بکات. داوای لە هەردووکیان کرد کە دانیشن. دواتر نووسینەکانی کردەوە و سەیرێکی کرد. ئەو بەشێکی لەو وەرەقە ئەمانەتییە بۆ ئەوان خوێندەوە. ئەو ئایەتانە بەو دەنگ و شێوازە

دڵکێشە، هەر کەسێکی دەخستە هەلەکەسەماوە. گەنجەکەش کەوتبوە هەلەکەسەما.

- مووسا چی دەڵێی؟

چاوەڕوانی وەڵامی میرزا مووسا نەبو و بەردەوام بوو:

بەڕای من هەرکەسێك بڕوای بە قورئان هەیە و پێیوایە لە لایەن خوداوە هاتۆتەخوارێ، نابێت تەنانەت یەك ساتیش گومان لەوە بکات کە ئەم وشانەش لە هەمان سەرچاوە دابەزیون، ئەگەرنا لە ڕێگای ویژدان لایداوە.

گەنجەکە ئاگای لەخۆی نەمابوو... کاتێ هاتەوە هۆش خۆی، بە کەللە شەکرێك و پاکەتە چایەك بەرەو قوتابخانە دەگەڕایەوە...

مەلا حسێن لە خۆشیان کەوتە شایی. ئەو دیاریانەی کە گەنجەکە بۆی هێنابوو بە ڕێزەوە ماچی کردن. گەنجەکە لەنکاو خۆی وەکو باڵیۆزێك هاتەبەرچاو کە دیاریی بۆ پاشایەك هێنابێت. هەڵسوکەوتی مەلا حسێن ئەو هەستەی لەلای دروست کردبوو. مەلا حسێن، گەنجەکەی لەباوەش گرت و چاوەکانی ماچ کرد. چەند وشەیەك لە دەمی مەلا حسێن دەرچوون کە گەنجەگە تێینەدەگەیشت.

- داوام لە خوایە، وەك چۆن دڵشادت کردم، شادی تاهەتاییت پێ ببەخشێت و دڵت پڕبێت لە خۆشی و نەمری.

گەنجەکە هێشتاش نەیدەزانی چی بووە؟ ئای چ پەیوەندییەك لە نێوان

ئەو میوانەی کە لە ڕواڵەتدا وەکو مەلایەکی خوراسانییە، لەگەڵ ئەو گەنجە نووریەی کە لە تاران دەژییێت هەیە؟ چ شتێك ئاگری خۆشەویستی لە دڵی ئەو دوو کەسە هەڵگیرساندوە؟ بۆ مەلا حسێن، کە هێندە بێبایەخە بەرانبەر بە دونیا، لە وەرگرتنی کەللە شەکرێك و پاکەتە چایەك هێندە دڵخۆش بووە؟ ئەمانە چەند پرسیارێك بوون کە تا چەندین ساڵ وەڵامەکەی بۆ ئەو گەنجە بە شاراوەیی مایەوە! تەنیا مەلا حسێن دەیزانی کە چ گەنجینەیەکی لە تاران دۆزیوەتەوە.

ئێستاکە مەلا حسێن ڕاسپاردەی خۆی لە تاران تەواو کردوە و دەبوایە بگەڕێتەوە خوراسان. بۆ گەنجەکە ئەو جیابونەوە ناخۆش و زەحمەت بوو. مەلا حسێن لە ڕوانگەی گەنجەکە، خدری زیندە بوو و ئەوی بە کانی ژیان گەیاندبوو.

مەلا حسێن نەیدەتوانی خەمی گەنجەکە ببینێت. هەوڵی دا لە ساتەکانی کۆتاییدا دڵی بداتەوە. پێی گوت کە ڕۆژەکان ڕۆژانێکی مەزنن. نهێنی خودا ئاشکرا بووە و بانگی ڕۆژی نوێ بەرز بۆتەوە. ئەوە ئەرکی ئێمەیە کە پەیامی خودا بە گوێ خەڵکدا بدەین.

گوتی کە تاران خاکێکی زۆر پیرۆزە و بەمزاونە ڕووداوی گەورە بەخۆیەوە دەبینێ. جەمالی خودا لەو خاکەوە وەدیار دەکەوێت. خوێنی زۆر لەپێناویدا دەڕێژرێت، بەڵام ئەم خوێنانە درەختی خودا بەهێزتر دەکەن و بەری پێدەگرن کە ڕۆژێك دێت کە هەموو گەلانی دنیا لەبەر سێبەری ئەم درەختەدا دەحەسێنەوە.

ڕەنگە مەلا حسێن دەیزانی کە قوتابیە گەنجەکەی قوتابخانە، واتە مەلا محەمەد نووری کە بوەتە هۆکاری گەیاندنی نووسینەکانی حەزرەتی باب بە خۆشەویستی جیهان– بوزورگ نوری–، بەمزوانە گیانی خۆی دەکاتە قوربانی و خوێنەکەی ئەو درەختە ئاو دەدات.

لە کۆتاییدا، مەلا حسێن گەنجەکەی ڕاسپارد کە ناوی ئەو بەگزادەیە بە هیچ کەسێك نەڵێت و ئەو مەسەلەیە لە لای هیچ کەسێك باس نەکات و بەردەوام دوعا بکات کە خودا بیپارێزێت تا بێتە فریادڕەسی بێچارەکان و کەوتوانی جیهان.

گەنجەکە لە مانای ئەو ڕاسپاردەیە نەدەگەیشت.

## بەشی چوارەم

# ڕۆژگاری سەخت

حەزرەتی باب داوای لە باوەڕدارەکانی سەرەتا کرد کە ئارەزووەکانی دونیا وەلابنێن و لە سەرتاسەری جیهاندا بڵاوببنەوە و فەرمانی نوێ ڕابگەیەنن. پێ گوتن:

ئەی هاوڕیانی ئازیزم، ئێوە هەڵگری پەیامی خودان. بەهۆی هەڵسوکەوتی جوان و گوتاری خۆتان، ببنە مەزهەری پەروەردگار. سەیری لاوازی و بێتوانایی خۆتان مەکەن، بەڵکو سەیری توانا و دەستەڵاتی خودا بکەن. بەناوی خودا ڕاپەڕن، پشت بە خودا ببەستن و سەرنجی بدەنێ و یەقین بن کە دوارۆژی رزگارکردن و سەرکەوتن بۆ ئێوەیە.

یەکەمین گروپی بڕواداران بە ناوی (حەیی)، یان ئەلفبای ژیان ناوزەد کران، لێوانلێو لە هێزی وشە و ئایەتەکانی حەزرەتی باب بوون، لە کاتێکدا کە دڵنیا بوون لە بەڵێنەکانی خودا، کەوتنەڕێ بۆ ئەوەی تا سەرتاسەری جیهان بە ئاگری عەشقی خودا دابگیرسێنن.

زۆری پێنەچوو کە ئەم ڕاپەڕینە فیداکاریانە دەیان و سەدان کەسی لە عێراق و ئێران و عەرەب کە زۆربەیان ئیسلام بوون، بە دڵی پاکەوە،

پێشوازیان لە فەرمانی نوێ کرد. هەر باوەڕدارێکی نوێ، بەشبەحاڵی خۆی تۆوی وشە چاکەکانی خودای لە زەوی پاکی دڵی ئەویدی دەچاند و سەدان باوەڕدار بوون بە هەزاران و سەدان هەزار کەس.

هەمان کات بە شەپۆڵی بڵاوبونەوەی وشەکانی خودا لە نێوان خەڵکانی خودا، ئاگری کینەی فەرمانی نوێی خوداش هەڵدەگیرسا. سەرۆکەکانی حکومەت و حاکمەکان کە لە پێشوازی بەرفراوانی فەرمانی نوێ، پێیانوابوو پلەوپایەیان دەکەوێتە مەترسییەوە، دەستیان خستە دەستی یەکتر و بە فەرمانێکی زاڵمانە کەوتنە هاندانی کۆمەڵانی خەڵك کە هێشتا لەبارەی فەرمانی خودا لێکۆڵینەوەیان نەکردبوو، لە دژی پەیامی خوداو و هەڵگرانی.

حەزرەتی باب لە پاییزی ١٨٤٦ی زایینی بەرەو ئەسفەهان کەوتەڕێ.

لەو رۆژەی کە میرزا حسێنعەلی نوری، ئایەتەکانی حەزرەتی بابی وەرگرت و بڕوای بە فەرمانی نوێ هێنا، بە تەواوی هێزەوە خەریکی برەودانی ئەو فەرمانە بوو. یەکەمین گەشتیان بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی ئاینی باب، بۆ خاکی باوپیرانی خۆی بوو، واتە مازاندەران.

هەواڵی هاتنی کوڕی میرزا بزورگی نووری، فرە زوو لەناو خەڵکدا بڵاوبووەوە. دۆست و ئاشنا و خزم و کەس هاتنە پێشوازی. هەموو تامەزرۆی ئەوەبوون کە هەواڵی نوێ وەرگرن. بەڵام قسەکانی ئەو، لە دەرەوەی چاوەڕوانی هەموویان بوو! ئەو باسی ئاینێکی نوێ و وەدیارکەوتنی فەرمانێکی نوێی دەکرد. وەدیارکەوتنی کەسێك کە

هەموو خەڵك چاوەڕوانی دەكرد، ئەو كەسەی كە هاتبوو تا یەكسانی و خۆشەویستی دووبارە لەسەر زەوی بەرقەرار بكات، كەسێك كە نێردراوی خودا بوو.

هەموویان بە چاكی دەیانزانی كە (ئەو) هیچ كات نەچۆتە قوتابخانە و شاگردی هیچ مامۆستا و فەیلەسوفێك نەبووە. لەگەڵ ئەو هەموەشدا، وشەكانی هێندە كاریگەری هەبوو لەسەر بیستەران كە خۆیان لە جیهانێكی نوێی مانا و چەمكەكان دەدۆزییەوە.

# بەشی پێنجەم

# لە ئەسفەهانەوە تا ئازەربایجان

چونکە حەزرەتی باب لە ئەسفەهان نزیك بوەوە، نامەیەکی بۆ حاکمی ئەو هەرێمە نووسی تێیدا داوای لێکرد تا ماڵێکی بۆ ئامادە بکات تا بچێتە ناوی.

مەنوچەهر خان موعتەمیدودەولە بە پێچەوانەی حاکمی شیراز، پیاوێکی چاك و بە ویژدان بوو، هێندە کەوتبووە ژێر کاریگەری ئەدەبیاتی نامەکە کە فەرمانی دا گەورەترین پێشەوای ئاینی ئەو هەرێمە ببێتە خانەخوێی حەزرەتی باب لە ماڵی خۆی و گەورەترین ڕێزیشی لێبگرێت.

ناوبانگی حەزرەتی باب بە مانەوەی لە ئەسفەهان ڕۆژ بەرۆژ پتر بوو. خەڵکی شار دەستە دەستە دەهاتن بۆ بینینی ئەو و بیستنی وشە پیرۆزەکان لە دەمی خۆیەوە. ئەوانەی کە دەیانبیست، خەڵکانی تریان هان دەدا بۆ هاتنەلای حەزرەت. ئەو ناوبەنگە بووەهۆی دروستبوونی ئێرەیی لە دڵی سەرۆکە ئاینییەکانی ئەو هەرێمە. ئەوانەی کە مەترسییان لە پلەو پایەی خۆیان هەبوو بە بێویژدانی خەریکی بڵاوکردنەوەی تۆمەت و قسەی بێبنەما بوون. ئەوان تەنانەت پیلانێکیشیان داڕشت بۆ کوشتنی. حاکم زۆر زوو لە پیلانی زانایانی ئاینی تێگەیشت و بڕیاریدا ئەو حەزرەتە بگوازێتەوە ماڵی خۆی.

پێکەوەبوونی حاکم لەگەڵ حەزرەتی باب بووەهۆی ئەوەی ئەویش کەمکەم هەستی بە گەورەیی و وەدیارکەوتنی ئەو کرد و لە کۆتاییدا ڕۆژێك لە خزمەتی ئەودا بوو گوتی:

خودا سەروەتێکی زۆری بە من بەخشیوە و نازانم لە چ ڕێگایەکدا خەرجی بکەم. ئەگەر مۆڵەتم بدەیت لە پێناو سەرکەوتن و پێشکەوتنی فەرمانی بەڕێزتان خەرجی بکەم. ئەگەر مۆڵەتیشم بدەیت کە بچمە تاران و لەگەڵ محەمەد شا قسە بکەم، ئەو بڕوایەکی زۆری بە من هەیە. ئەگەر ڕاستی فەرمانەکەی پێ بگەیەنم، باوەڕ دێنێت و ئەوکاتە تەواوی خەڵکی ئێران ئەم ئاینە خوداییە قەبوڵ دەکەن.

حەزرەتی باب بە باشی هەستی بە فیداکارییەکانی حاکم دەکرد، لەمڕووەوە فەرموویان:

نیەتێکی باشت هێناوە، چونکە نیەتی باوەڕدار لە کرداری گرنگترە، خوا پاداشتی ئەو نیەتە پاکەت پێ دەبەخشێت، بەڵام تەمەنی من و تۆ لەو دونیایەدا هێندە نەماوە کە ئەنجامی ئەو شتەی کە باست کرد بە چاوی خۆمان ببینین.

حاکم بە تامەزرۆییەکی زۆرەوە سەیری حەزرەتی بابی دەکرد و بە هەر وشەیەکی ئەو، رووحێکی نوێی بەبەردا دەهات. ئەو حەزرەتە بەردەوام بوو:

ئیرادەی حەق بەوە پەیوەست نییە کە بە سامان و دەستەڵات فەرمانەکەی بڵاو ببێتەوە. ئەو نایەوێت بە هۆی حاکمان و پاشاکان ئەم ئاینە بەهێز بێت. ئیرادەی خودا ئەوەیە کە بە هۆی بێچارەکان و هەژاران و خوێنی شەهیدان،

فەرمانی خوا بەرز بێتەوە. دڵنیابە کە خودا تاجی شانازی تاهەتایی دەکاتە سەرت و بەرەکەتی بێئەندازەی بەسەرتدا دەبارێنێت. سێ مانگ و نۆ ڕۆژی تر، بە عزەتەوە، لەم جیهانەوە دەچیتە جیهانی تاهەتایی.

حاکم بەم قسە، زۆر بەختیار و شادمان بوو، بۆ چوون بۆ دونیاکەی تر خۆی ئامادەکرد. کارە ناتەواوەکانی خۆی ئەنجام دا و لە وەسیەتنامەی خۆی نووسی، هەموو سەروەت و سامانەکەی بە حەزرەتی باب ببەخشن.

ڕێك سێ مانگ و نۆ ڕۆژ دوای ئەوە، حاکمی ئەسفەهان کۆچی دوایی کرد. ڕۆژێك دوای کۆچی دوایی حاکم، براکەی کە جێنشینی ئەو بوو، وەسیتەنامەکەی دەستکەوت و لەناوی برد. دواتر نامەیەکی بۆ محەمەد شا نووسی و پرسی کە چی لە حەزرەتی باب بکات. شا دەستوری دا کە بە دزییەوە بینێرێتە پایتەخت. لە ڕاستیدا نیەتی محەمەد شا ئەوەبوو کە بیبینێت. هەر بۆیە باب لەگەڵ سوارەکانی حاکم، بەرەو تاران کەوتنەڕێ.

لەو کاتەدا، سەرۆك وەزیرانی ئێران، میرزا ئاقاسی، پیاوێکی خۆپەرست و ناشایستە بوو. ئەو زۆر دەترسا لەوەی کە ئەگەر حەزەرتی باب بێنە ناو تاران و لەگەڵ محەمەد شا یەکتری ببینن، پلەو پایەی خۆی لە دەست دەدات. لەمڕووەوە شای وا لێکرد کە بڕیارەکەی بگۆڕێت و حەزرەتی باب بنێرێتە ئازەربایجان.

کاتێ کە حەزرەتی باب لە تەورێز، مەڵبەندی ئازەربایجان، چووە ژوورەوە، خەڵکی شار بۆ بینینی ئەو لە شەقامەکان کۆببوەنەوە. تامەزرۆیی ئەو خەڵکەی کە ناوبانگی ئەویان بیستبوو، بۆ بینینی ئەو حەزرەتە بە ڕاددەیك بوو کە حاکمی شار دەستووری دا کە جارچی جاڕی ئەوە بدات لە شار کە

هەرکەسێك بچێتە لای حەزرەتی باب، دەست بەسەر موڵك وماڵیدا دەگیرێت و خۆشی دەخرێتە بەندیخانەوە. لەگەڵ ئەوەشدا خەڵك هەربژی و تەکبیری بۆ حەزرەت دەنارد لەو کاتەی کە بە شەقامەکاندا تێدەپەڕی. تەنانەت هەندێك کەس دوای تێپەڕبوونی ئەو حەزرەتە خاکی بەرپێیان ماچ کرد.

حەزەرتی باب ماوەیەکی کورت لە تەورێز مایەوە و دواتر گواستیانەوە بۆ قەڵای ماکۆ، کە کەوتۆتە ناو چیاکانی ئازەربایجان و شوێنێکی لاچەپە و لە زستاندا زۆر سارد دەبێت.

ئەو ژوورەی کە شوێنی مانەوەی ئەو حەزرەتە بوو لەو قەڵایەدا، نە دەرگای هەبوو و نە زۆپا. جگە لەخۆی دوو هاوڕێی، تەنیا دوو پاسەوان و چوار سەگ لەو قەڵایەدا نیشتەجێ بوون.

خەڵکی ئەو دەڤەرە سوننی بوون. سەرۆك وەزیرانی پێیوابوو بە ناردنی ئەو حەزرەتە بۆ دوورترین خاڵی وڵات، لە نێوان خەڵکانێکی جودا مەزهەب، لایەنگرەکانی کەم دەبنەوە و کەمکەم، فەرمانەکەی لەبیر دەکرێت. ئەو نەیدەزانی ئاگری فەرمانی خودا هەڵگیرساوە و دەستی هیچ مرۆڤێك ناتوانێت بیکوژێنێتەوە.

زۆر زوو گەورەیی و پلەوپایە و نەرمونیانی و خۆشەویستی حەزرەتی باب، خەڵکی ماکۆ و پاسەوانەکانی قەڵای خستە ژێر کاریگەری خۆی. کەمکەم توندوتیژی هەڵسوکەوتی پاسەوانەکان کەم بوەوە و دەرگای قەڵا بەڕووی ژمارەیەکی زۆر لە باوەڕداران کرایەوە، کە لە ڕێگەی دوورەوە دەهاتن بۆ زیارەتی ئەو حەزەرتە.

حەزەرتی باب لە ماکۆ، کتێبی بەیانی فارسی هێنایە خوارەوە. ئەم کتێبە یەکێکە لە گرنگترین نووسینەکانی حەزرەتی باب و یاساکانی فەرمانی نوێ و لەو کتێبەدا هاتۆتە خوارێ. حەزەرتی باب لە هەموو بەشەکانی ئەم کتێبە، پەیڕەوەکانی خۆی ئامادە کردوە بۆ دەرکەوتنێکی زۆر مەزنتر و باوەڕدارەکانی ڕاسپاردوە کە لە هەر ساتێکدا چاوەڕوانی وەدیارکەوتنی دواتر بکەن. حەزرەتی باب مەزهەری وەدیارکەوتنەکەی پاش خۆی کە زۆر نزیك بوو، بە (مَن یَظهِرُهُ الله) ناوزەد کرد، بە مانای کەسێك کە خودا وەدیاری دەخات. لە ڕاستیدا، وەدیارکەوتنی خۆی بە پێشەکییەك بۆ ئەو وەدیارکەوتنە مەزنە دەناساند کە بڕیار بوو زۆر زوو بگات.

## بەشی شەشەم

# ڕۆژی نوێ هاتووە

جیهانی مرۆڤایەتی ڕۆژبەڕۆژ لە پێشکەوتندایە. فەرمانی خوداش لە پێشکەوتندایە. مەزهەرەکانی وەدیارکەوتنی خودا وەکو ئاوێنەیەکن کە ئیرادەی ئەو لەو جیهانەدا کەمکەم وەدیار دەخەن و نیشانی دەدەن. هەرچەند تێگەیشتنی پەیڕەوانی مەزهەری وەدیارکەوتوەکان زۆرتر دەبێت، ڕێنمایی و وتە ئاسمانییەکان بە گوێرەی توانای زەینی مرۆڤ، کەمکەم دێتەخوارەوە. زۆربەی باوەڕدارە نوێیەکان لە سەرەتادا لە گەورەیی دەرکەوتنی تازە تێناگەن و بەردەوام خەریکی ئەنجامدانی شەریعەتی کۆن دەبن. تەنیا بە تێپەڕبوونی کات تێدەگەن کە مەزهەری دەرکەوتنی نوێ هەندێك لە یاسا کۆنەکانی گۆڕیوە و ئامانجی ئەوە بووە کە چەند یاسایەکی نوێ دابڕێژێت بۆ قۆناغی دوای کامڵبوونی جیهانی مرۆڤایەتی.

ئەو یەهودیانەی کە چاوەڕوانی وەدیارکەوتنی مەسیح بوون، پێیانوابوو کە ئەو بۆ برەودان بە ئاینی مووسا و شەریعەتی تەورات وەدیاردەکەوێت. بەڵام بە دیارکەوتنی مەسیح کەمکەم زانرا کە ئەو حەزرەتە شەریعەتێکی نوێی بۆ جۆری مرۆڤەکان هێناوە.

ئەم بارودۆخە لەبارەی وەدیارکەوتنی نوێش هەر ڕاستە. ئەو موسڵمانانەی کە حەزرەتی باب لە نێوانیاندا دەرکەوت، پێیانوابوو کە تەنانەت یەك وشەش لە ڕێنماییەکانی حەزرەتی محەمەد ناگۆڕێت. هەربۆیە حەزەرتی باب فەرمانی خۆی کەمکەم ئاشکرا کرد. لە سەرەتادا پلەوپایەی ئەو بەناونیشانی حەزرەتی مەهدی لەناو خەڵك بە ڕوونی ئاشکرا نەبوو. پەیڕەوانی یەکەم ڕاسپێردرابوون کە موژدە بە خەڵك بدەن کە (باب)ی وەدیارکەوتنی مەهدی بۆتەوە. کەمکەم حەزرەتی باب بەناونیشانی بەڵێنپێدراوی ئیسلام ناسێنرا، بەڵام زۆربەی خەڵك هێشتا ئاگایان لە پلەو پایەی ڕاستەقینەی ئەو نەبوون. لە ساڵەکانی سەرەتای وەدیارکەوتن، هیچ گۆڕانکارییەك بەسەر شەریعەتی ئیسلامدا نەهات، چونکە بچوکترین گۆڕانکاری بۆ زۆربەی پەیڕەوانی ئەو، وێنا نەدەکرا. بەڵام ئێستا کاتی ئەوە هاتوە.

دوای دابەزینی کتێبی بەیان، کۆبوونەوەیەکی مەزنی پەیڕەوانی باب لە گۆشەیەکی تری وڵاتی ئێران بە ئەنجام گەیشت. خوا ئیرادەی کردبوو تا لەگەڵ دابەزینی حوکمەکانی لە کتێبی بەیاندا، لە ڕواڵەتیشدا هەندێك یاسای وەدیارکەوتنی پێشتر کە کاتەکەی ڕابوردبوو، نەسخ بکاتەوە و بەم شێوەیە شوێن و گەورەیی پایەی ئەو دەرکەوتە بە ناونیشانی ئاینێکی نوێ و سەربەخۆ، بەڵام پەیوەست بە زنجیرەی ئاینەکانی پێشتر، ئاشکرا بکات.

بەدەشت شارۆچکەیەکە، لە باکوور لە نزیکی شاهرود. کۆبوونەوەی بەدەشت لە مانگی تەموزی ١٨٤٨ بەسترا. هەشتاوچوار کەس لە باوەڕدارانی حەزرەتی باب کە کەسانی بەرجەستە و پایەبەرز بوون لەو کۆبوونەوە ئامادەبوون. بەرجەستەترین بەشدارانی ئەم کۆبوونەوەیە، میرزا

حسێنعەلی نووری (کە لەوەبەدوا بەناوی حەزەرتی بهاءالله باسی دەکەین) بەڕێز قدوس، بەڕێز تاهرە بوون.

ئەگەرچی لە سەرەتادا وا دەهاتەبەرچاو کە حەزرەتی بەهائوڵڵا پلە و پایەیەکی لە نێوان هاوڕێیانی حەزرەتی باب هەبێت، بەڵام ڕۆڵی ئەو لە ئەنجامدانی ئەو کۆبوونەوەیە، چارەنوسساز بوو. حەزرەتی بەهائوڵڵا هەموو ڕۆژێك تابلۆیەکی دادەبەزاند تا لە نێوان یاراندا بخوێندرێتەوە و بە هەر یەکێك لە بەشداربووان ناوێکی تازەی دەبەخشی. وەکو تاهرە بە مانای پاك و پوخت بۆ قورەتولعەین و قدوس بە مانای پیرۆز بۆ حاجی محمد عەلی بارفرۆش، دوایین پیتی حەیی. هەروەها لەو ڕۆژە بەدواوە، خۆشی بەناوی بهاء ناسرا.

بۆ یارانی بەدەشت، دواتر نامەیەکی ئیمزادار بە قەڵەمی حەزەرتی باب نووسرا و هەریەکێك بەو ناوەی کە حەزرەتی بەهائوڵڵا بۆی دانابوون، بانگکران.

ڕۆژێك حەزرەتی بەهائوڵڵا بەهۆی نەخۆشی، کەوتنە جێگاوە. یاران هاتنە خزمەتی. لەنکاو حەزرەتی تاهرە کە گەوهەری عیسمەت و پاکی بوو، بەبێ حیجاب هاتە ناو کۆڕەکە. هەندێك لە دانیشتوانی کۆڕەکە و یارانی باب هەستیان بەوە کرد کە مایەی شەرمەزارییە بۆ خۆی و ئاینە نوێیەکەی. بەڕێز قودوس تووڕە دەهاتە بەرچاو. بەڵام بەڕێز تاهرە هیچ گوێی پێنەدان و بە مەتینی و خۆشحاڵییەوە، یارانی بانگهێشت کرد بۆ شکاندنی دابونەریتەکان. بەڵێ، ئەو باس و خواسەی کە لە ئەنجامی ئەو کارە، لە نێوان حەزرەتی تاهرە و حەزرەتی قودوس هاتە پێشەوە، بە ناوبژیوانی حەزرەتی بەهائوڵڵا کۆتایی پێهات. لەڕاستیدا دژایەتی جەنابی قودوس لەگەڵ ئەو ڕەفتارە،

تەگبیرێکی دانایانە بوو تا یارانی لاواز، توانا و بەرگەی ئەو ڕووداوە گەورە و نوێیە کەمکەم پەیدا بکەن.

هەرچەندە، بەداخەوە ژمارەیەك لە پەیڕەوانی حەزرەتی باب لە بەدەشت لە ئەنجامی ئەو مەسەلەیە، دوورکەوتنەوە لە فەرمانی نوێ، بەڵام زۆربەیان پتەو مانەوە بەسەرنجڕاکێشیەکی نوێوە. حەزرەتی بەهائوڵلا، ئەو هەلەی قۆستەوە و هەڵاتنی ڕۆژێکی نوێی ئاهەنگ گێڕا.

ئازایەتی و شەهامەتی حەزرەتی تاهرە لەو ڕۆژەدا، وەکو تێگەیشتن لە وێنەکان– لە نیشانەکانی ڕۆژی قیامەت، دابەزیو لە قورئان– بوو کە لەگەڵ ئەو، ئاینی کۆن نەسخ بوەوە ئاین و یاسای نوێ دامەزرا.

کۆبونەوەی بەدەشت، بە خاڵی وەرچەرخان دەژمێردێت بۆ قۆناغێکی پڕ هەراوهۆریا لە پێشکەوتنی ئاینی بابیدا. زۆر زوو دوای ئەوە ئازار و ئەشکەنجەی باوەڕداران دەستی پێکرد و زۆریان شەهید بوون، وەك بڵێی کۆبوونەوەی بەدەشت شوێنی ماڵئاوایی بوو کە لەوێوە هاوڕێیان هاتنە دەرەوە و کاری قارەمانانەیان لەخۆیاندا نیشاندا تا لە جیهانی دواتردا دووبارە لە دەوری یەکتری کۆببنەوە.

دوای تەواوبوونی کۆبوونەوەی بەدەشت، پەیڕەوانی حەزرەتی باب بەرەو مازەندەران کەوتنەڕێ. لە لادێیەکی سەر ڕێگا لایاندا بۆ حەسانەوە، بەڵام کەوتنە بەر هێرشی بەشێکی دانیشتوانی ئەوێ و بە ناچاری ئەوێیان بەجێ هێشت و هەریەکە بەرەو لایەك پەڕاگەندە بوو. حەزرەتی بەهائوڵلا بەردەوام بوو لە سەفەری خۆی بەرەو نوور.

## بەشی حەوتەم

# شەهید بوون

هەواڵی خۆشەویستی حەزرەتی باب لە نێوان خەڵکی ماکۆدا، بە گوێی حاجی میرزا ئاقاسی سەرۆك وەزیران گەیشتبوەوە. ئەو کە پێیوابوو بە دوورخستنەوەی ئەو حەزرەتە بۆ ماکۆ بە گشتی مەشخەڵی فەرمانی خودا کوژاوەتەوە، ئێستا کە دەبینتێت ئەو مەشخەڵە بە خێرایی هەموو وڵات دادەگرێت. ئەو دووبارە فەرمانی دا تا بیگوازنەوە بۆ قەڵای چەهریق. بەڵام ئەم دوورخستنەوەیەش هەر سوودی نەبوو. خەڵکانی ماڵەکانی دەوروبەر و پاسەوانانی قەڵا، سەرنجیان بەرەو کەسایەتی حەزرەتی باب راکێشرا و تەنانەت هەندێك لە زانای ئاینی ناسراوی دەڤەرەکەش باوەڕیان بە فەرمانی نوێ هێنا.

ئەگەر بچوکترین ڕووداو لە هەر گۆشەیەکی وڵات ڕویدابایە، سەرۆك وەزیران بە هۆی سیخوڕەکانی خۆی دەیزانی، چ جای ئەوەی کە مەسەلەیەك بە هۆی ئەوەوە لە ماوەیەکی کەمدا ژمارەیەك لە پیاوە مەزنەکانی ئاینی لە پلە و پایەی جیاوازدا باوەڕیان بەو ئاینە نوێیە هێنابوو و بەدوای مەزهەری ئەو وەدیارکەوتە نوێییە کەوتبوون. جگە لەوەش، حەزرەتی باب لە سەرەتای وەدیارکەوتنیان چەندین نامەی ئیمزادار و لەوح – بە وەحی ئیلاهی– بە

ناوی شا و سەرۆك وەزیران دابەزاندبوو و بۆیانی ناردبوو. شێوازی دەربڕینی خودا لەو نامانەدا، بە ڕاددەیەك بە هەیبەت و بە توانا و مەزن بوو، سەرۆك وەزیران کە ئەو نامانەی دەخوێندەوە دەکەوتە لەرزین و ورەی ئەو بۆ لەناوبردنی حەزرەتی باب بەهێزتر دەبوو.

حاجی میرزا ئاقاسی لە کۆتاییدا بڕیاریدا کە کۆڕێك پێکبهێنێت تا پێشەوایانی ئاینی، حەزرەتی باب دادگایی بکەن و باشترین ڕێگا بۆ لەناوبردنی خۆشەویستییەکەی لەناو خەڵك هەڵبژێرێت.

هێنایان بۆ تەورێز و کۆڕێکی دادگایی پێکهات. سەرۆکەکانی ئاین و دارودەستەی حکومەت هەوڵیاندا کە تاوان بۆ ئەو حەزرەتە دروست بکەن و لە پلەو پایەی ئەو حەزرەتە کەم بکەنەوە، بەڵام نەیانتوانی. مەزنی و ڕێزی حەزرەتی باب، کە شایستەی (مەزهەری پیرۆزی) خودایە، بەسەر هەموویاندا زاڵ بوو. ئەو لە وەڵامی پرسیارەکانی ئەواندا کە تۆ بانگەشەت چییە؟ فەرموویان:

من هەر ئەو مەهدییەم کە هەزار ساڵە چاوەڕوانی ئەون و کە ناوی ئەو دەبیستن لە شوێنی خۆتان هەڵدەستن و دوعا دەکەن کە زوتر دەرکەوێت. بەڕاستی دەڵێم کە ئەرکە لەسەر خۆرهەڵات و خۆرئاوا گوێڕایەلی من بن.

ئەو دەربڕینانە بیری ئامادەبووانی خستە لەرزە. ئیدی شوێنی قسەکردن نەبوو. کۆڕەکە کۆتایی پێهات، بەبێ ئەوەی مەبەستی سەرۆك وەزیران بێتەجێ. لە جیاتی ئەوە لەو ڕۆژە و لەو کۆڕەدا دوای چوار ساڵ، لە کاتی باسکردنی فەرمانەکە بە مەلا حسێن لە شیراز، ئەو حەزرەتە کاتەکەی بە

گونجاو بینی تا پلەو پایەی خۆی بە ئاشکرا بە ئامادەبوونی وەلی عەهد و لە نێوان زانایانی ئاینی و خەڵك ڕابگەینێت. چەند ڕۆژێك دوای ئەوە حەزەرتی بابیان بۆ چەهریق گەڕاندەوە.

ڕۆژ بە ڕۆژ ناوبانگ و خۆشەویستی حەزرەتی باب پتر دەبوو و ژمارەی پەیڕەوانی بە خێرایی زیادی دەكرد. سەدان كەس لە زانایانی ڕاستەقینە و دڵپاكی ئیسلام هەستیان بە ڕاستی ئەو كردبوو و بۆ خزمەت و سەركەوتنی فەرمانەكەی ڕاپەڕیبوون و هەندێكیشیان شەهید ببون. نمونەی هەرەدیاریان سەید یحیا دارابی بوو كە یەكێك بوو لە زانایانی ئەو سەردەمە و لە لایەن پادشاوە ڕاسپێردرابوو كە لەبارەی فەرمانی حەزرەتی باب لێكۆڵینەوە بكات و دوای سێ دانیشتن لەگەڵ ئەو حەزرەتە وەها باوەڕی هێنا كە لە كۆتاییدا، گیانی خۆی كە ئازیزترین شتێكی بوو لە ڕێگای خۆشەویستی حەزرەتەوە بەخشی. لە نێوان هەموو زانا و پیاوچاكان و عارف و زانا و فەقێیەكانی كە باوەڕیان هێنا دەتوانرێت ئاماژەو بەو كەسانە بكرێت: مەلا حسێن بشرویی، مەلا محەمەدعەلی زنجانی، مەلا عەلی بزعانی، بەڕێز شێخ حەسەن زنوزی، بەڕێز میرزا محەمەد ڕەوزەخوێنی یەزدی، بەڕێز سەید ئیبراهیم خەلیل تەورێزی، بەڕێز مەلا جەعفەر قەزوینی، بەڕێز شێخ سوڵتان كەربەلایی كە زۆربەیان زانایانی سەردەمی خۆیان بوون. هەروەها كەسایەتی تری وەكو بەڕێز مەلا محەمەمد حەساری كە خاوەنی پلەی ئیجتیهاد بوو، بەڕێز مەلا باقر ئەردەكانی كە ئیمام و خەتیبی ئەردەكان بوو، بەڕێز حاجی سەید جەواد ئەسفەهانی كە لە پیاوچاكان و لە خانەدانی زانایانی بەناوبانگی ئەسفەهان بوو، ئەوانە هەموویان پەیوەندییان بە ئاینی نوێ كرد. زۆربوونی ژمارەی

ئەو زانایانە کە بە ویژدانەوە بەدوای ڕاستیدا گەڕاون و لە کۆتاییدا دوای باوەڕهێنان گیان و ماڵی خۆیان کردۆتە قوربانی دڵسۆزی بۆ ئایینەکەیان. هەر ئەمانە بوونە هۆی ئەوەی کە زۆربەی زانایان و سەرۆکانی ئاین کە جڵەوی خەڵکیان لەدەست بوو بە دەمارگرژییەوە لە پێناو پاراستنی پلەو پایەکەیان دژایەتی خۆیان بۆ فەرمانی نوێی خودا پتر بکەن.

میرزا ئاقاسی سەرۆك وەزیران پێیوابوو ئیتر هیچ ڕێگایەك نەماوە. بە درێژایی ئەم ساڵانە هەرچی هەوڵیدا ئەو ئاگرە هەڵگیرساوە بکوژێنێتەوە، پتر هەڵگیرسا. لەگەڵ ئەوەی زۆربەی زانایانی ئاینی ئەو سەردەمە لەو وڵاتە دژایەتییان دەکرد، ئێستا زۆرێك لە موسڵمانان شیفتەی حەزرەتی باب بوون. ئەو لە بنبەستێکی سەیر گیری کردبوو. نەیدەزانی ئەگەر دەستی بە خوێنی سەید سور بێت، چی ڕوودەدات. بزوتنەوەیەکی مەزن بنەمای باوەڕ و بیری خەڵکی خستبوە لەرزین.

ئەو نەیدەتوانی ئەو خاڵە تێبگات کە دەرکەوتنی (مەزهەر پیرۆزەکان)ی خودا جیاوازە لەگەڵ بزوتنەوەی کۆمەڵی مرۆڤایەتیدا. ئەگەرچی (مەزهەری وەدیارکەوتن) دەتوانێت گۆڕانکاریەکی گەورە لە کۆمەڵگە و بیرەکان دروست بکات، بەڵام هەرگیز لەگەڵ توانا مادییەکاندا بەراورد ناکرێت.

ئەو دەیزانی کە تا حەزرەتی باب لەم جیهانە بێت، مەحاڵە بتوانن پێشگری لە بڵاوبوونەوەی فەرمانەکەی بگیرێت. لەمڕووەوە چەندین جار بیریان لە لەسێدارەدانی ئەو حەزرەتە کردبووەوە. وەلێ کێ گەرەنتی ئەوە دەدات کە دوای ئەوە هەموو شتێك کۆتایی دێت؟

زۆر زوو، بیرێکی تر مێشکی سەرۆك وەزیرانی بەخۆیەوە خەریك كرد. لەگەڵ مردنی محەمەد شا، ئەو سەرەتا مەقام و دواتر هەموو شتێکی خۆی لەدەست دا و ئەو هەموو عزەت و سامان و دەستەڵات و خۆشبژییە بوو بە زەلیلی و نەخۆشی. کەسێك کە سەردەمێك بە تەنیایی فەرمانڕەوایی وڵاتی ئێرانی دەکرد، ئێستا هێندە بووە جێگای نەفرەتی خەڵك کە گیانی لە مەترسیدابوو. چوە هەر لادێیەك دەریان كرد، تا لە كۆتاییدا پەنای بۆ شوێنە مەزهەبییەکان برد و لە كۆتاییدا لە ئێران دوورخرایەوە. ساڵێك دواتر لە زەلیلترین حاڵەتدا لە کەربەلا مرد.

کەس نازانێت کە ئەو لەو ماوەیەدا، بیری لە دەربڕینەکانی حەزرەتی باب کردبوەوە کە پێی فەرمووبوو: بەو عزەتەوە دڵخۆش مەبە، چونکە لە پشت ئەو عزەت و دەستەڵاتە، زەلیلی و ئەشکەنجەیەکی توند شاردراوەتەوە.

دوای محەمەد شا، ناسرەدین شا لە ساڵی ١٨٤٨ی زاینی هاتە سەر تەخت ئەو لە منداڵییەوە لە ناو غەفڵەت و غروور پەروەردە ببوو، ئێستا گەنجێکی کەم ئەزموونە و تاجی شاهانەی کراوەتەسەر، هەموو کاروبارێکی دایەدەست سەرۆك وەزیران.

سەرۆك وەزیرانی نوێ، میرزا تەقی خان ئەمیر کەبیر، عاقیبەت بڕیاری لەسێدارەدانی حەزرەتی بابی دەرکرد. حەزرەتی بابیان هاوڕێ لەگەڵ نووسەری وەحی سەرلەنوێ هێنایەوە تەورێز و لە نزیکی سەربازگەیەك بەندیان کرد.

ڕێك ئەو كاتەی كە حەزرەتی بابیان بەرەو شوێنی بەندیخانەكە دەبرد، گەنجێك بە ڕاكردنەوە لەنێوان خەڵكەوە خۆی گەیاندە حەزرەت و كەوتە بەرپێی و پاڕایەوە لێی كە من لەخۆت جودا مەكەوە و مۆڵەتم بدە كە لەگەڵ تۆدا بم. حەزرەتی باب پێی فەرموو: هەڵسەوە، تۆ لەگەڵ ئێمەدای، تا سبەینی چ موەقەدەرێك دەبێ. ئەو گەنجەیان یەكسەر دەستگیركرد و لەگەڵ دوو كەسی تر لە هاوڕێیانی لە هەمان حوجرەی كە حەزرەتی باب و نووسەرەكەی بەند بوون، بەندیان كردن. ئەم گەنجە دواتر بە ناوی ئەنیس ناوبانگی دەركرد.

ئەنیس ئەو كاتەی كە حەزرەتی باب لە تەورێز بوو، لەخودی حەزرەتەوە لەبارەی فەرمانی نوێ بیستبووی و بڕیاری دابوو كە بەدوای پەیكەری پیرۆز بچێتە چەهریق. مەشخەڵی عەشقی خودا هێندە لە دڵی ئەنیس هەڵگیرسابوو كە تاكە ئارەزووی، بە قوربانیبوون بوو لەڕێگەی فەرمانی نوێ. بەڵام زڕباوكەكەی كەوتبوە گومان لە هەڵسوكەوتی كوڕەكەی، لەماڵدا بەندی كرد و خستیە ژێر چاودێرییەكی توندەوە.

ئەنیس چەندین هەفتەی بە وێرد و موناجات بەسەر برد و بەردەوام لە دەرگای خودا دەپاڕایەوە تا هەلێك بڕەخسێت و بگاتە حزوری خۆشەویستەكەی. ڕۆژێك كە نقومی دوعا و موناجات و ڕاز و نیاز بوو، شتێكی سەیری هاتە بەرچاو. حەزەرتی بابی لەبەرانبەر چاوەكانی خۆی بینی، حەزرەتی باب پێی فەرموو: خۆشحاڵ بە كاتی ژوان نزیكە. بەم زوانە هەر لەم شارەدا بەبەرچاوی خەڵكەوە لەخاچم دەدەن و دەبمە ئامانجی گوللەی دوژمنانی خودا. جگە لە تۆ هیچ كەسێكی تر لەو مەوهیبەتە ناكەمە هاوبەشی خۆم. موژدە بێت كە تۆ

ئەو ڕۆژە لەگەڵ من جامی شەهیدبوون دەنۆشی.

ئەنیس لەوەبەدوا، سەبورانە چاوەڕوانی ڕۆژی ژوان بوو. ئەو کاتەی کە بتوانێت بگاتە خۆشەویستی خۆی ...

ئەوەبوو کە بە ئارەزووی دڵی خۆی گەیشتبوو.

ئەو شەوە، خۆشییەك لە دەموچاوی حەزرەتی باب ئاشکرا بوو. لە کۆتایی خۆشی و شادی لەگەڵ ئەنیس و نووسەر و دوو کەسی تر لە پەیڕەوانی دڵسۆز کە بەند بوون لەگەڵی قسەی دەکرد. لەوانە فەرمووی: گومانی تێدا نییە کە سبەینێ من دەکوژن. ئەگەر بە دەستی ئێوە بێت باشترە و خۆشتر. یەکێك لە ئێوە هەڵسێت و کۆتایی بە ژیانی من بهێنێت.

هیچ کەس نەیدەتوانی ئەوە وێنا بکات کە بە دەستی خۆی ژیانی زاتێکی وەها کۆتایی پێبهێنێت. هەموو بێدەنگ مانەوە و فرمێسك بە چاویاندا هاتەخوارێ. لەنکاو ئەنیس لە شوێنی خۆی هەڵسا و لە کاتێکدا کە پشتێنەکەی لە پشت دەکردەوە گوتی: هەر چۆنێك بەڕێزتان بفەرموون ئەمری پیرۆز جێبەجێ دەکەم. ئەو پشتێنەکەی بە دەستەوە بوو تا ئەگەر خۆشەویستەکەی ئیرادە بکات، هەر بەو پشتێنە، بیانگەیەنێتە خواستی خۆی. ئەو سێ کەسە بە گریانەوە دەیانڕوانیە ئەنیس. حەزرەتی باب فەرمووی: ئەو گەنجەی کە هەڵسا تا داواکاری من بە ئەنجام بگەینێت، سبەینێ لەگەڵ من شەهید دەبێت. من ئەوم هەڵبژارد تا لە گەیشتن بەو تاجی شانازیە لەگەڵ مندا هاوبەش بێت.

بەرەبەیانی ڕۆژی دواتر ٩ی تەموزی ١٨٥٠ حەزرەتی باب لەگەڵ

نووسەرەکەی خۆی خەریکی بەیانەکانی بوو کە لەنکاو پاسەوانێك هات و قسەکانی پێ بڕی. پێی فەرموو: تا من ئەو قسانەی خۆم تەواو نەکەم لەگەڵ ئەودا، هەموو دونیا بە تیر و شیرەوە هێرشم بۆ بکەن، تەنانەت موویەك لە سەری من کەم نابێتەوە. پاسەوان کە گرنگی بەیانی پیرۆزی نەدەزانی، حەزرەتی لەگەڵ خۆی برد.

حەزرەتی بابیان لەوێوە بردە ماڵی موجتەهیدە گەورەکانی تەورێز. ئەوان بەبێ هیچ گومانێك، بڕیاری کوشتنی ئەو حەزرەتەیان ئیمزا کرد.

لە هەمان بەرەبەیاندا، حەزرەتی بابیان بردە ناو سەربازگەیەك کە نزیکەی دە هەزار کەسیان تێدا کۆ کردبوەوە تا لەسێدارەدانی نێردراوی خودا ببینن، بردیان و بە دەستی (سام خان)ی ئەرمەنییان سپارد کە فەرماندەی فەوجی سەربازان بوو، تا حوکمەکەی جێبەجێ بکات. بەڵام سام خان کە کەوتبووە ژێر کاریگەری هەڵسوکەوتی حەزرەتی باب، بە تەواوی ڕێزەوە پێی گوت: من مەسیحیم و هیچ دوژمنایەتییەکم لەگەڵ تۆدا نییە. توخووا، ئەگەر تۆ لەسەر حەقیت کارێکی وا بکە کە دەستم بە خوێنی تۆ سوور نەبێت.

حەزرەتی باب فەرموویان: تۆ خەریکی ئەو کارەت بە کە پێتسپێردراوە. ئەگەر تۆ نیەتت دڵسۆزییە، حەق لەو قەیرانە ڕزگارت دەکات.

سام خان فەرمانیدا بە سەربازەکانی خۆی تا بزماری ئاسنین لە دیوارەکەدا و دوو گوریسیان بە بزمارەکانەوە بەستەوە کە بە یەکێکیان حەزرەتی باب و بەوی تریان ئەنیس هەڵواسن. دواتر سەربازان بە سێ ڕیز وەستان، لە هەر ڕیزێك دووسەد و پەنجا کەس، هەر ڕیزە و یەك لە دوای یەك تەقەیان کرد.

دوای ئەوەی حەوت سەد و پەنجا گوللە تەقێندران، خەڵکەکە دیمەنێکیان بینی کە بە زەحمەت دەیانتوانی باوەڕی بکەن. ئەنیس وەستابوو، لە کاتێکدا کە ئاسەواری گوللە بە لەشییەوە نەبوو و حەزەرتی باب نەمابوو، گوللەکان تەنیا گوریسەکانیان پچڕاندبوو!

مقۆمقۆ کەوتە ناو خەڵکەکە. هەر کەسە و قسەیەکی دەکرد و لێکدانەوەیەکی هەبوو. پاسەوانان کەوتنە گەڕان بەدوایدا، لە کۆتاییدا لەو حوجرەیەدا دۆزییانەوە کە پێشتر تێیدا زیندانی بوو. ئەو حەزرەتە بە تەواوی ئارامییەوە دانیشتبوو و دوایین وەسیەتەکانی خۆی بۆ نووسەرەکەی خۆی دەردەبڕی، فەرمووی: من قسەکانی خۆم تەواو کردوە. ئێستا هەر شتێکتان دەوێ بیکەن، دەگەنە مەبەستی خۆتان.

ئەو پاسەوانەی کە پێشتر بردبووی، ئەو قسەیەی بیرهاتەوە کە گوتی: تا ئەو قسانەم تەواو نەکەم کە لەگەڵ ئەو هەمبوو، ئەگەر هەموو دونیا بە تیر و شیرەوە هێرشم بکەنە سەر، تەنانەت موویەکیش لە سەری من کەم نابێتەوە.

ئەو ئیتر نەیدەتوانی بمێنێتەوە و هاوبەشی ئەو کارە ناشیرینە بێت. کەوتە بەر پێی و لێی پاڕایەوە و داوای لێبوردنی لێکرد و لەو کاتەوە بە دوا بە یەکجاری وازی لەو کارەی خۆی هێنا.

سام خانیش لە بینینی ئەو ڕوداوە واقی وڕما و نەیهێشت سەربازەکانی ئەو لەنوێوە گوللەبارانی بکەن. فەرمانی پێدان و ئەو شوێنەیان بەجێهێشت. هەربۆیە فەوجێکی تر خۆی ئامادەکرد و جارێکی تر باب و ئەنیسیان لەو شوێنەدا بەدار هەڵواسی.

لەو کاتەی کە سەربازانی نوێ، خۆیان بۆ تەقە ئامادە دەکرد، حەزرەتی باب ڕووی کردە کۆمەڵە خەڵکەکە و دوایین بەیانەکانی خۆی دەربڕی:

ئەی خەڵکینە، ئەگەر منتان دەناسی، وەکو ئەو گەنجە کە پلەوپایەی زۆر بەرزترە لە ئێوە، لەم ڕێگەیەدا دەبوونە قوربانی. ڕۆژێك دادێ کە من بناسن، بەڵام ئەو ڕۆژە من لەنێوان ئێوەدا نیم.

خۆری تەمووز گەیشتبوە ناوەڕاستی ئاسمان. هەمان ئەو ساتە دەنگی بانگ لە بڵندگۆی مزگەوتەکان بەرز بووەوە... و سەربازەکان تەقەیان کرد...

ئەمجارە گوللەکان ئامانجیان پێکا و جەستەکانی باب و ئەنیسی پێکەوە گرێدا و هەردوو پەیکەر بوون بە یەکێك، بەڵام دەموچاویان هیچ شتێکی بەرنەکەوت.

# بەشی هەشتەم

# قەیرانی نوێ

لەگەڵ شەهیدبوونی حەزرەتی باب، هاوڕێیانی ستەمدیدە و پەریشان کە تا ئەو کاتە مەرگی کارەساتباری زۆرێك لە یارانی خۆیان بینیبوو، خۆشەویستی دڵی خۆشیان لەدەست دا.

دوای ماوەیەکی کورت، ئەمیر کەبیر کە حوکمی لەسێدارەدانی حەزرەتی بابی دەرکردبوو، بە فەرمانی ناسرەدین شا کوژرا و سەرۆك وەزیرانی نوێ، میرزا ئاقاخان نووری، جێگەی گرتەوە.

هاوڕێیانی حەزرەتی باب، لەگەڵ ئەوەی لە بیری خۆیاندا (شا)یان بە هۆکاری سەرەکی کوشتنی ڕێبەری خۆیان دەزانی، لە هەموو حاڵەتێکدا خێرخوازی حکومەت و میللەت بوون و هەوڵیاندا کە هێزی خۆیان بخەنەگەڕ بۆ بڵاوکردنەوەی فەرمانی نوێ بە چاکەکاری و بەڵگە و سەلماندن. بەڵام لەو بەینەدا چەند کەسێك هەبوون کە بیریان لە تۆڵەسەندنەوە کردەوە، بیری نەگونجاویان لە مێشکی خۆیاندا پەروەردە کرد و لە حاڵەتی نائومێدی پێیانوابوو کە ئەگەر هێرش بکەنە سەر ڕیشە و بنەمای ئەو زوڵمانە، دەتوانن یەکسانی بەرقەرار بکەن، ئیتر بڕیاریاندا شا بکوژن.

حەزرەتی بەهائوڵڵا ئێستا لە لایەن هەمووان وەکو ڕێبەری بابییەکان ناسراوە. هەربۆیە ئەو چەند کەسە، نیەتی خۆیان بەگوێی حەزرەتی بەهائوڵڵا گەیاند. ئەوان بە ڕاشکاوی حەزرەتیان لە جێبەجێکردنی ئەو بیرۆکەیەی مێشکیان ئاگاردار کردەوە، ئەویش ئەو کارە نالەبارەی ڕەتکردەوە وفەرموویان کە ئەم کارە، بەڵای نوێ بەسەر کۆمەڵگەی بابی دێنێت و دەبێتە هۆی سەختییەکی زۆر بۆ کۆمەڵگەی بابی.

بەڵام ئەوان، جەرگ سوتاو و غەمگین بوون و دڵیان لە ئاگری کینە و تۆڵەسەندنەوەدا دەسوتا. ئامۆژگارییەکانی حەزرەتی بەهائوڵڵایان لەگوێ نەگرت و دەستیان دایە کارێك کە تاهەتایە لاپەڕەکانی مێژووی بابییەکانیان لەکەدار کرد و پەڵەیەکی ڕەشیان خستە سەر ئەو مێژووەی کە هەر بە پاکی و لەخۆبردوویی و کاری قارەمانانە ڕازابوەوە.

لە ١٥ی ئابی ١٨٥٢ کە ڕۆژێکی گەرمی هاوینی بوو. ناسەرددین شا لە ماڵە هاوینەکەی خۆی لە شەمیران کە نزیکی تارانە، بۆ بەرنامەی ئەسپسواری بەیانیان هاتبوە دەرەوە و پاسەوانەکانی چەند پێیەك لە پێشیدا دەڕۆیشتن. هەموو شوێنێك ئارام و هەموو شتێك بەدڵی خاوەنشکۆ بوو. بە تەواوی سەرسوڕمانەوە لەنکاو گەنجێکیان بینی وەك بڵێی کە دەیەوێت عەرزوحاڵێك پێشکەشی شا بکات، لە قەراغ جادەکە لە چاوەڕوانیدا وەستابوو. تا پاسەوانەکان بەخۆیاندا هاتنەوە، گەنجەکە بە دەمانچەی ساچمەیی بەرەو ڕووی شا تەقەی کرد، وەلێ ساچمەکانی تەنیا شانی شای بریندار کرد. ئەوکاتە هەوڵیدا کە لە ئەسپەکە دایبەزێنێت و بە خەنجەر بیکوژێت. پێش ئەوەی بتوانێت کاری خۆی بکات، بە دەستی پاسەوانانی شا کوژرا.

گەنجێکی تر لە پەناگاکەی هاتە دەرەوە و بەرەو ڕووی شا دەمانچەکەی خۆی تەقاند و ئەویش نەیتوانی ئامانجەکە بپێکێت.

شای لاو و بریندار تووڕە، فەرمانی نابووتکردنی ئەوانەی دا کە لەپشت ئەو کارەوە بوون. لە ئەنجامی ئەو ڕووداوە هەرایەك دروست بوو. دوژمنان ئەو هەلەیان قۆستەوە و ئەو کەسانەی کە هیچ ئاگایان لە فەرمانی تازەی باب نەبوو، لە دژی بابییەکان هانیان دان بۆ کرداری زاڵمانە.

لاشەی ئەو گەنجەی کە یەکەم جار هێرشی کردە سەر شا و یەکسەر کوژرا، لە کلکی ئێستر بەسترا و تا تاران لەسەر زەوی ڕاکێشرا و لەوێ لاشەکەیان لە ناوەڕاست شەق کرد و بەسەر دەروازەکاندا هەڵیانواسی. هاودەستەکەی کە ئامادەنەبوو لەژێر ئازار و ئەشکەنجەدا هاوکارەکانی خۆی بناسێنێت، قوڕقوشمیان لە گەروو کرد و هاودەستی سێیەمیشیان ڕووت کردەوە لەشیان کون کون کرد و مۆمیان تێدا چەقاند و مۆمەکانیان هەڵکرد و بەناو کوچە و کۆڵانەکاندا گەڕاندیان، لە کاتێکدا کە کۆمەڵانی خەڵك بە هەراوهۆریا جوێنیان پێدەدا و سوکایەتیان پێدەکرد.

ئەو ڕووداوانەی کە دوای ئەو مەسەلە ڕوویدا بە ئاسانی باسناکرێت. حکومەت و زانایان ئەو هەلەیان قۆستەوە، خەڵکی بێئاگایان لە دژی بابییەکاندا هاندا، و ڕاپەڕین بۆ کوشتن و بڕینی بابییەکان. دەروازەکانی شاریان داخست بە شێوەیەك کە هیچ کەسێك بەبێ پرسیار و وەڵام بۆی نەبوو بچێتە دەرەوەی شار. ماڵ بە ماڵ بەدوای بابییەکاندا گەڕان، دەستگیریان کردن و بە شێوەیەکی وەحشیانە و زاڵمانە کوشتنیان.

ئەو ڕۆژەی هەوڵی کوشتنی شا درا، حەزرەتی بەهائوڵڵا میوانی برای سەرۆك وەزیران بوو لە لادێیەکی نزیك تاران. هەواڵی ئەو ڕووداوە زۆر زوو بە گوێی ئەوان گەیشت. دایکی شا، حەزرەتی بەهائوڵڵای بە هاندەری سەرەکی دەزانی بۆ کوشتنی کوڕەکەی و دەیەویست دەستگیری بکەن. ئاشناکان داوایان لە حەزرەتی بەهائوڵڵا کرد کە ماوەیەك لە شوێنێکدا خۆی بشارێتەوە تا ئەو هەراوهۆریایە کەم دەبێتەوە. بەڵام حەزرەتی بەهائوڵڵا پێشنیارەکەی ئەوانی قەبوڵ نەکرد و ڕۆژی دواتر بەسواری بەرەو ئۆردوگای شا کەوتنەڕێ.

شا و سەرۆکەکانی دەربار لە بیستنی ئەو هەواڵە زۆر سەریان سوڕما. بۆ ئەوان زۆر سەیر بوو کە تاوانبار بەم شێوەیە و بەم تۆمەتە گەورەیەوە جەسارەتی کردوە کە خۆی دەربخات. شا فەرمانی دا تا دەستگیری بکەن. ئەو هەوڵانەی کە دەیانەویست پەنایەك لە ماڵی سەرۆك وەزیران بۆ حەزرەت بدۆزنەوە بێ ئەنجام مانەوە.

حەزرەتی بەهائوڵڵایان لە شەمیران کە سی کیلۆمەتر لە تارانەوە دوورە، دەستگیر کرد و دواتر لە زنجیریان دا. دواتر بە سەرکۆتی و پێخواستی، بەرەو تارانیان برد، لەنێو ڕێگادا بەهۆی گەرمای هاوین حەزرەت سەختیی زۆری کێشا.

لەبەر خۆری گەرمی هاویندا کە بەردی شەقامەکانی سوور کردبوەوە، وەزیرزادەیەکی گەنج کە ڕەنگە هیچ کاتێك بە بێ پێڵاو نەڕۆیشتبێت، ئێستا بە دەستی بەستراو و پێخاوسی ڕێگای سی کیلۆمەتریان بڕی کە هاوکات دەورەدرابوو بە چەندین سەرباز و کۆمەڵێك کەسی کە حەزرەتیان بە دوژمنی شا دەزانی، تا گەیشتنەجێ لە جوێن و سوکایەتیپێکردن پێی بەردەوام

بوون. وێناکردنی ئەو ڕووداوانەی ئەو ڕۆژە ڕەنگە کەمێك لەو کارەساتەی کە حەزرتی بەهائوڵڵا تووشی بوو بێتە بەرچاومان.

سیاه چاڵ کە بە مانای کونەڕەش دێت لە زمای فارسیدا، زیندانێك بوو کە حەزرەتی بەهائوڵڵایان لەو ڕۆژە کارەساتبارەدا تێدا بەند کرد. ئەم زیندانە، لە کۆنەوە، خەزێنەی حەمامێك بوو کە ببووە بەندیخانە و دەخمەیەکی سارد و تەنگ و تاریك و شێدار بوو کە خراپترین تاوانباریان تێدا دەئاخنی.

سەد و پەنجا کەس لە دز و ڕێگر و پیاوکوژ لەوێدا زیندانی بوون. زەویەکە بە خۆڵ و زبڵ داپۆشرابوو، پڕ بوو لە زیندەوەری ئازاردەر. زۆربەی بەندییەکان جلوبەرگ و پێخەفی وایان نەبوو. بۆنی بۆگەنی ئەو شوێنە بێ ئەندازە بوو. لەژێر هەلومەرجێکی وەها سەخت و زاڵمانەدا، حەزەرتی بەهائوڵڵا و ژمارەیەك لە بابییەکان بە فەرمانی شا بەند کران. قاچەکانیان لە کۆت دابوو، (کۆت ئەو دارە قورس و کونەیە کە قاچی زیندانیەکانیان تێدەخست و قوفلیان دەدا) و زنجیرێکی قورسیشیان بە ملی پیرۆزیاندا بەستبوو.

لە سێ ڕۆژ و سێ شەوی یەکەمدا، نان و ئاویان نەدانێ. بنەماڵەکەی ئەو خواردنیان ئامادە کرد و داوایان لە پاسەوانان کرد کە مۆڵەت بدەن خواردنەکانیان بۆ ببەن. هەرچەندە لە سەرەتادا نەیاندەهێشت، بەڵام لە کۆتاییدا قەبوڵیان کرد. بەڵام هیچ کەسێك دڵنیا نەبوو لەوەی کە خواردنەکەیان پێدەگات یان نا و ئایا ئەو قەبوڵی دەکرد خواردن بخوات، لە حاڵەتێکدا کە بەندییەکانی تر هەموویان برسی بوون؟

حەزرەتی بەهائوڵڵا بارودۆخە ترسناکەکەی خۆی و هاوڕێکانی لە کونەڕەشدا وەها وەسف کرد:

ئەو کەسانەی کە لەو ساڵە و لەو سامانەدا شەهید بوون لەگەڵ من لە کونەڕەش بەند بوون. هەوای ئەو زیندانە بێئەندازە بۆگەن و قورس و زەویەکەی شێدار و پیس و پڕبوو لە زیندەوەری ئازاردەر و کەشەکەی تاریک و بە هیچ شێوەیەك تیشکی خۆری پێنەدەگەیشت. هەموومانیان لە یەك شوێندا بەند کرد. پێمان لە زنجیر و ملمان لە کۆت بوو. ئێمە لە دوو ڕیزدا لە بەرانبەر یەکتری دانیشتبووین. نزیك گزنگی بەیان، لە هەموو شەوێکدا زیکرێکم پێ دەگوتن کە بە دەنگێکی بەرزەوە دەیانخوێند. ڕیزی یەکەم دەیانگوت (قُل اللّه یَکفی مِن کُلّ شَیء) ڕیزی دووەم وەڵامیان دەدایەوە و ( عَلی اللّهِ فَلیتَوَکّل المُتَوَکِلون) و تا سەرەتای بەیانی ئەو زیکرە درێژەی هەبوو...

... هەموو ڕۆژێك کارگوزارانی ئەوێ دەهاتن یەك دوو کەسیان بە ناو و ناونیشان بانگ دەکرد، دەیانبردن بۆ گۆڕەپانی شەهیدکردن. کە زنجیریان لە مل هەڵدەگرتن، بە خۆشحاڵییەکی تەواوە دەهاتنە لای ئێمە. ئێمە موژدەی نیعمەتەکانی خوداوەندمان پێدەدان لە جیهانەکانی مەلەکوتدا. ئەوان لەگەڵ ئەوانی تردا یەك بە یەك ماڵئاواییان دەکرد، پەلەیان بوو بۆ گۆڕەپانی شەهیدبوون. کارگوزارەکان گیانبازی هەر یەکێکیان بۆ دەگێڕاینەوە. هەموو خۆشحاڵ بوون و بەردەوام بە سوپاس بۆ خوا زمانیان دەکردەوە. موسیبەتەکانی زیندان هیچ یەك لە رووحانیەکانی سارد نەدەکردەوە.

## بەشی نۆیەم

# لەدایکبوونی ئاینێک

پەیڕەوانی ئاینەکان دەزانن کە فەرمانی خودا بەردەوام لە پێشکەوتندایە و هیچ توانایەک لەسەر زەوی ناتوانێت پێشی پێ بگرێت.

حەزرەتی باب شەهید کرا، هەزاران کەس لە پەیڕەوەکانیان بە شێوەیەکی ناشیرین و زاڵمانە کوژران و بەرجەستەترین باوەڕداران شەهید بوون. تاکە ئومێدی پاشماوەکان، لە دەخمەیەکی تەنگ و تاریک بەند بوو و فەرمانی خودا خەریک بوو بە یەکجاری بخرێتە بۆتەی فەرامۆشی و بیرچوونەو.

رێک لەو دەوروبەرە لە تاریکی کونەڕەشدا، خودا حەزرەتی بەهائوڵڵای ئاگادار کردەوە بۆ پایەیەکی مەزن. ئەو کە لە تاریکی دەژیا، هەوای پیسی هەڵدەمژی و لە ژێر کۆت و زنجیری قورسدا ملی خوار ببوەوە، یەکەمین نووسینی هاتەخوارێ و وەحی خودای لە رووحی پیرۆزی خۆیدا وەرگرت.

لەژێر ئەو هەلومەرجە ترسناکەدا، (رووحی مەزنترینی خودا) خۆی بۆ ئەو ئاشکراکرد و فەرمانی پێدا کە هەڵسێتەوە و وشەی خودا بۆ خەڵکانی جیهان وەدیار بخات.

دواتر حەزرەتی بەهائوڵڵا لەبارەی ئەو ڕووداوە فەرموویان: هەست دەکرا

شتێك لە لای سەرینیەوە بە سنگیدادەڕژا، وەکو ڕووبارێکی مەزن کە لە لوتکەی چیایەکی زۆر بڵندەوە برژێتە سەر زەوی.

جۆرە دەرکەوتنێکی خودای بینی لە کاتێکدا کە لە نێوان زەوی ئاسماندا وەستابوو لەگەڵ ڕواڵەت و ناخی ئەو دەدوا. ئەو دەرکەوتنە خوداییە حەزرەتی بە خۆشەویستی جیهانییەکان و مەزهەری توانای خودایی و جوانی خوداوەند دەزانی و ئەو بە دەستپێکەری خەلقی بوون دەزانێت. هەروەها خودا لە سیاە چال بەڵێنی سەرکەوتن و هاوکاری پێدەدا و دەیەوێت تا بۆ فەرمانی بەدیع (نوێ) ڕاپەڕێت. زیاتری ئەو ڕووداوە لە لەوحەکانی حەزرەتی بەهائوڵڵادا باسکراوە.

بەم شێوەیە لە پشت تاریکی کونەڕەش، خۆری ڕاستی گزنگیدا و بەڵێنی حەزرەتی باب لە کتێبی بەیان هاتەجێ وفەرمانی بەهایی لەدایك بوو.

حەزرەتی بەهائوڵڵا بۆ وەدیارخستنی فەرمانی خۆی، چاوەڕوانی کاتێکی دیاریکراو بوون لە داهاتوودا کە خودا بۆی دانابوو.

کاتێ کە حەزرەتی بەهائوڵڵا لە کونەڕەش و لەژێر زنجیر دابوو، زانا خراپەکان و دوژمنانی هەوڵی زۆریاندا تا فەرمانی کوشتنی لە شا وەربگرن. بەڵام پێویست بوو کە بیسەلمێنن کە ئەو لە پیلانی کوشتنی شا دەستی هەبووە. هەرچەند دوژمنان پتر هەوڵیان دەدا تا بەڵگە لە دژی ئەو پەیدا بکەن، بێگوناهی ئەوان پتر ڕوون و ئاشکرا دەبوو. دوژمنانی زاڵم چونکە نەیانتوانی بەڵگە لە دژی ئەو بدۆزنەوە، بڕیاریاندا کە ژەهر بخەنە خواردنەکەی. ژەهرەکە هێندە بەهێز بوو کە یەکسەر کاریگەرییەکەی دیاریدا و دەستی لە خواردن کێشایەوە.

لە کۆتاییدا شا و سەرۆك وەزیران، میرزا ئاغا خان نووری، چارەیەکیان نەدۆزییەوە جگە لە ئازادکردنی حەزرەتی بەهائوڵڵا نەبێت، بەڵام ئازادیەکەیان بە مەرج بوو، مەرجەکەش ئەوەبوو کە ئەو حەزەرتە ئێران بەجێبهێڵێت.

ئێستاکە حەزرەتی بەهائوڵڵا دوای چوار مانگ زیندانی سەخت، نەخۆش و ماندوو بوو. هەلومەرجەکانی فرە سەختی زیندان، زۆر لاواز و نەخۆشی کردبوو بە شێوەیەك کە لە جێگەی نەخۆشیدا، خرایە ژێر چاودێرییەوە. ئەڵقەکانی زنجیر، برینی قوڵی لە سەر ملی ئەو حەزرەتە دروستکردبوو کە هەرچەندە بە تێپەڕبوونی کات چاك بوونەوە بەڵام شوێنەواریان تا کۆتایی ژیان هەر مایەوە.

لەگەڵ ئەو هەموو گرفتانەدا، تەنیا یەك مانگ مۆڵەتی هەبوو تا خۆی بۆ سەفەری سەخت ئامادە بکات. مۆڵەتی ئەوەیان بە حەزرەتی بەهائوڵڵا دابوو کە شوێنی دوورخستنەوەی خۆی هەڵبژێرێت. ئەو بەغدای هەڵبژارد.

ئەم سەفەرە لە ١٢ی کانونی دووەم تا ٨ی نیسانی ١٨٥٣ درێژەی کێشا. لە خراپترین سەرمای زستاندا، حەزرەتی بەهائوڵڵا و بنەماڵەکەی ناچار بوون لە ڕێگای خۆرئاوای ئێرانەوە کە سەرماکەی زۆر سەختە، سەفەر بکەن. ئەو ئازوقەیەی کە بۆ ئەو سەفەرە ئامادە کرابوو بەشی نەدەکردن و ئەوان ناچار بوون بە کەمێك خواردن ڕازی ببن. بەڵام پارێزەری ئەم گروپە بچوکەی موسافیرەکان، خودای بە توانا و دەستەڵاتدار بوو کە بە پشتیوانی خۆی ئەوانی بە سەلامەتی گەیاندە بەغدا.

بەمشێوەیە ئێران خۆی بێبەشکرد لە مەوهیبەتی حزوری حەزرەتی بەهائوڵڵا و ناچاریکرد کە وڵات بەجێبهێڵێت و هەرگیز نەگەڕێتەو وڵاتی خۆی.

یەکێك لە مێژوونووسە بەهاییەکان لەبارەی دوورخستنەوەی حەزرەتی بەهائوڵڵا لە ئێران دەنووسێت:

**بە نزیکبوونەوەی حەزرەتی بەهائوڵڵا بە سنووری وڵات، خولێکی مێژووش لە کۆتایی خۆی نزیك دەبوەوە. ئایا خەڵکی ئێران هەستیان بەو زیانە گەورەیە دەکرد کە خەریك بوو لە دەستیان دەدا؟ ئەو خەڵکانەی کە لە ژێر کاریگەری زانا خراپەکان، نقووم بوو لە گێژاوی جەهالەت و نغرۆ لە دەریای تەزویر و ریاکاری بوون، ئەو خەڵکانەی کە بەردەوام وانەی دەمارگرژییان دەخوێند و غەفلەت چاوەکانیانی کوێر کردبوو، ئەو خەڵکانەی کە جڵەوی خۆیان دابووە دەست دەستەیەکی بەرژەوەندخواز و هەلپەرست و بە فێڵ و تەڵەکە هەڵخەڵاتابوون، نسیبی بینین و تێگەیشتنییان نەبوو. بەم شێوەیە ڕزگارکەری جیهان لەنێوان ئەواندا ڕۆیشت. کەسێك کە سەردەمێك جێگەی ڕێز و ستایشی هەموو کەسێکی هەژار و دەوڵەمەند بوو، بەرز و زانا، شازادە و شوان بوو، ئێستا لە لایەن کەسانێکەوە دەردەکرێت کە بەردەوام لە خۆشەویستی و بەخشین، یەکسانی، ئاگاداری و خۆشەویستییەکەی بەهرەمەند ببون. ئێران بە ڕواڵەت حەزرەتی بەهائوڵڵای لەدەست دا، بەڵام ئایا هەرگیز کاریگەرییە رووحانیەکەی دەرکەوتنی ئەو سەرچاوە ڕووناکییەی لەسەر ئەو وڵاتە و وڵاتانی تری جیهان دادەبڕێت؟**

## بەشی دەیەم

# گەشتی بێ گەڕانەوە

وڵاتی ئێستای عێراق بەشێك بوو لە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی. حەزرەتی بەهائوڵڵا لە یەکێك لە گەڕەکە کۆنەکانی شاری بەغدا، ماڵێکی بەکرێ گرت. لە مانگەکانی دواتری هاتنی ئەو حەزرەتە، ژمارەی ئەو بابیانەی کە دەهاتنە بەغدا پتری کرد. بەداخەوە زۆربەیان دوودڵ و پەرێشان بوون، هەندێکیان هەندێ کاریان دەکرد کە شایستەی پەیڕەوانی حەزەرتی باب نەبوو. حەزرەتی بەهائوڵڵا لە هەمان ساتەکانی یەکەمی هاتنی بۆ بەغدا دەستی بە چاککردنی ئەخلاق و هەڵسوکەوتی بابییەکان کرد کە ڕێنماییە سەرەکیەکانی حەزرەتی بابیان لەبیرچووبوەوە. ئەو حەزرەتە هەموو ئەو بابیانەی کە تازە هاتبوونە بەغدا بە چاوی خۆشەویستیەکی بێئەندازە سەیری دەکردن، یارمەتی دەدان تا دڵی خۆیان پاك بکەنەوە و رووحێکی تازە بدۆزنەوە. ئەو ڕێنمایی و فەرمان و بیرهێنانەوانەی حەزەرتی بەهائوڵڵا بە مەبەستی سەرەکی حەزرەتی باب و هەوڵی ئەو بۆ ئامادەیی رووحانی گشتی بۆ وەدیارکەوتنی دواتر بوو، کەمکەم گیانێکی تازە کرایەوە بەبەر بابیە سیسیبووەکاندا. لە ژێر کاریگەری کەسایەتی ئەو حەزرەتە، کۆمەڵگەی بابی کەوتە گۆڕان و لە نوێوە ئومێدەوار بوەوە. لە یەکەمین

ساڵی نیشتەجێبوونیدا، حەزرەتی بەهائوڵڵا لە بەغدا سەرنجی زۆر کەسی بۆ خۆی ڕاکێشا و لەو بەینەدا تەنانەت هەندێك کەس هەستیان بە پلەوپایەی حەزرەتی بەهائوڵڵا کرد بەڵام هێشتا کاتی ئەوە نەهاتبوو کە ئەم پلەوپایە و لێپرسراویەتییە رووحانییەی ئەو حەزرەتە بۆ هەموان با ئاشکرایی ڕابگەیندرێت.

بەڵام ئەفسوس کە لەو بەینەدا خەریك بوو قەیرانێکی نوێ سەرهەڵبدا. ئەمجارە سەرچاوە و شوێنگەکەی لەناوخۆی کۆمەڵگەی بابی بوو. هۆکاری ئەو گرفتانەش، زڕبرا بچوکەکەی حەزەرتی بەهائوڵڵا بوو، یحیا ئەزەل خۆی بە جێنشینی حەزرەتی باب دەزانی.

لە راستیدا حەزرەتی باب بە پێویستی نەزانیبوو کە جێنشینێك بۆخۆی دیاریبکات. چونکە دەیزانی کە بەڵێنپێدراوی هەموو سەردەمەکان بەم زوانە دەردەکەوێت. ئەو بە ڕاسپاردەی حەزرەتی بەهائوڵڵا و یەکێکی تر لە یاران، میرزا یحیایان بە (مەرجەعی بە ناو) ناساند. ئەم کارە بوەهۆی ئەوەی کە سەرنجی دوژمنان لە حەزرەتی بەهائوڵڵاوە بۆ لایەکی تر بکێشرێت و ئەوان لە ئاسایشدا بمێننەوە تا بتوانن هەوڵ بدەن بۆ بەرەوپێشبردنی فەرمانی خودا.

یحیا ئەزەل لە منداڵییەوە لەژێر سێبەری چاودێری و خۆشەویستی و پشتیوانی حەزرەتی بەهائوڵڵادابوون. بەڵام لە لایەك جەسارەتی کەم بوو لە لایەکی تریش سەرۆکایەتی و سەروەری دەویست. شەهیدبوونی حەزەرتی باب تووشی دڵەڕاوکێیەك و ترسێکی وەهای کردبوو کە نزیك بوو باوەڕی خۆی لەدەست بدات، لە ترسی گیانی خۆی بۆ ماوەیەك لەگەڵ دەروێشەکان

هەڵاتبوو بۆ چیاکانی مازەندەران. ئەم هەڵسوکەوتەی ئەو، ژمارەیەك لە بابییەکانی ئەو دەوروبەرەی لە فەرمانی خودا دوورخستەوە.

یحیا دوای بەڕێکەوتنی کاروانی موسافیرانی خودایی بەرەو بەغدا، بە گۆڕینی جلوبەرگ و سەروسەکوت خۆی گەیاندە بەغدا. لەوێ پارەیەکی لە حەزرەتی بەهائوڵڵا وەرگرت تا خەریکی بازرگانی بێت و بە ناوێکی نوێوە لە دەوروبەری شار نیشتەجێ بێت. ئەو بابیانەی کە بە تامەزرۆییەکی فراوانەوە دەهاتنە بەغدا تا کەسێك ببینن کە خۆی بە جێنشینی حەزەرتی باب ناساندبوو، بێهیوا و نائومێد دەبوون. یحیا پێشوازی لە هیچ کەسێك نەدەکرد، تەنانەت ئەو کەسانەی کە لە پاکی و دڵسۆزیاندا هیچ گومانێك نەبوو، بە ناونیشانی سیخوڕ نەیاندەهێشت بیبینن. هەمان ئەو کەسانە کە دەچوونە خزمەت حەزرەتی بەهائوڵڵا بە گەرمی و خۆشەویستییەکی وەها پێشوازییان لێدەکرا کە هەستیان بە هەموو شتێك دەکرد. زۆرێك لەو کەسانە تێدەگەیشتن کە هەموو شتێك وەها نییە کە دێتەبەرچاو. یحیا بەناو پلە و پایەیەکی هەبوو بەڵام ئەو شایستەیی و بەهرە پێویستەی نەبوو. بەڵام هەریەك لە پەیڕەوانی حەزرەتی باب کە دەهاتنە خزمەت حەزرەتی بەهائوڵڵا نیشانەکانی چاکی و کامڵ بوونیان بە ئاشکرا لەودا دەبینی و نائاگایانە پەلکێشی پیاوچاکی ئەو حەزرەتە دەبوون و هەستیان بەوە دەکرد کە حەزرەتی بەهائوڵڵا جیاواز و باشترە لە خەڵکانی تر.

ڕێزی فراوان و عەشقی بێسنووری پەیڕەوانی حەزرەتی باب بۆ حەزرەتی بەهائوڵڵا و گەورەیی شایستەیی و پلەوپایەی ئەو حەزرەتە لەنێوان کاربەدەستانی حکومەت، کاریگەری تێکدەرانەی بەسەر یحیا ئەزەلدا

هەبوو. ئاگری ئێرەیی وەها هەڵگیرسا کە داوێنی هەر جۆرە شەرم و حەیایەك بسوتێنێت. ئەو لەگەڵ یەکێك لە هاودەستەکانی کە بێشەرمتر لەو بوو، کەوتنە دووبەرەکی نانەوە و چاندنی تۆوی گومان و دڵەڕاوکێ بۆ کار و مەبەستەکانی حەزرەتی بەهائوڵڵا لە نێوان بابییەکاندا.

جارێکی تر هەوری ڕەشی گومان و ترس و ناخۆشی باڵی کێشا بەسەر کۆمەڵگەی بابیدا. سەردەمی کورتی ئارامی و ئاسودەیی رابورد و ڕۆژبەڕۆژ موسیبەت و بەڵاکانی حەزرەتی بەهائوڵڵا پتر بوون. وشەی ناپەسەند و بیری نەگونجاو لە نێوان بابییەکاندا، کەمکەم بوە هۆی ناکۆکییەکی تووند. بەڵام ئەو دڵەی کە لە سنگی حەزرەتی بەهائوڵڵا لێیدەدا، ناسکتر لەوە بوو کە بەرگەی ئەو هەموو ناکۆکییەی نێوان باوەڕداران بگرێت.

بەرەبەیانی رۆژێکی بەهاری ١٠ی نیسانی ١٨٥٤ کاتێ کە ئەندامانی ماڵەوە لەخەو هەڵسان، هەستیان بەوە کرد کە ئەو حەزرەتە رۆیشتوە. بێ ئەوەی هیچ کەسێك ئاگاردار بکاتەوە لە ئامانج و شوێنی مەبەست، شاری بەجێهێشتبوو.

بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە کار و هەڵسوکەوتەکانی یحیا ئەزەل چ ئەنجامێکیان دەبێت، حەزرەتی بەهائوڵڵا پێیان باش بوو کە بێ ئاگاداری هیچ کەسێك، بچێتە کێوەکانی کوردستان لە باکوری خۆرهەڵاتی بەغدا.

هیچ کەسێك ناتوانێت ئەندازەی غەم و خەفەتی بنەماڵەکە لە دووری ئەوان وێنا بکات. کوڕە گەورەکەی کە تەمەنی دە ساڵ بوو و هەستی بە پلەوپایەی ئەو دەکرد، لە هەموویان پتر غەمگین بوو.

حەزرەتی بەهائوڵڵا بە تەنیایی لە کێوەکانی نزیك سلێمانی خەریکی ڕازونیاز بوو لەگەڵ خودا و بە کەمێك خواردن قەناعەتیان دەکرد. هەندێ جاریش کەمێك شیری لە شوانەکانی ئەو ناوچەیە وەردەگرت و هەندێ جاریش بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی خۆی دەچوە شار. بەڵام لەگەڵ ئەو پەیوەندییە زۆر کورتانەشیدا لەگەڵ خەڵکی ناوچەکە، گەورەیی و لەخۆبردوویی ئەو حەزرەتە، نەیدەتوانی لەبەرچاوی ئەوان بە شاراوەیی بمێنێتەوە. عەشق و خۆشەویستی و حیکمەتی و زیرەکی ئەو حەزرەتە، خەڵکی سلێمانی ڕاکێشابوو بۆخۆی و ناوبانگی لە دەڤەرەکانی دەوروبەریش دەنگی دایەوە.

پتر لە یەك ساڵ، هیچ کەسێك لە بەغدا شوێنی ژیانی حەزرەتی بەهائوڵڵای نەدەزانی، تا ئەو ڕۆژەی هەواڵی هەبوونی کەسێکی جیاواز و زۆر دانا لە سلێمانی گەیشتە بەغدا. هەموو تێگەیشتن کە ئەو کەسە هیچ کەسێك نییە جگە لە حەزرەتی بەهائوڵڵا، هەربۆیە باوەڕدارێکی جێی متمانەیان نارد تا داوای لێبکات کە بگەڕێتەوە. حەزەرتی بەهائوڵڵا داواکاری ئەوانی قەبوڵ کرد و کۆتایی بەو کۆچە دوو ساڵییە هێنا کە بە ئارەزووی خۆی هەڵیبژاردبوو.

لەو ڕۆژانەی کە حەزرەتی بەهائوڵڵا لە بەغدا نەبوو، پلەوپایەی باوەڕداران بە کەمترین ئاستی خۆی گەیشتبوو. هەروەك کە چاوەڕوان دەکرا، میرزا یحیا تەنانەت نەیتوانیبوو خۆی بسەلمێنێت لەناو کۆمەڵگە بچوکەکەی بەغداش. ژمارەیەك لە بابییەکان لە شوێنی جۆراوجۆردا، هەندێ کاریان کردبوو کە بۆ فەرمانی گرانبەهای بابی مایەی شەرمەزاری بوو. هەربۆیە حەزرەتی بەهائوڵڵا جارێکی تر ژیاندنەوەی کۆمەڵگەی گرتە ئەستۆی خۆی.

لە ئازاری ١٨٥٦ز هەموو یاران ئاگادار کرانەوە لە هەواڵی هاتنەوەی حەزرەت و دەرگای ماڵەکان بەڕووی خۆبەخشانی ڕاستی کرانەوە. ئەو ماڵە سادە و بێ باق و بریقەی کە حەزرەتی بەهائوڵڵا و بنەماڵەکەی تێیدا دەژیان، بووە مەڵبەندی داواکارانی ڕاستی و گەشتیارانی کۆچبەر. لەو سەردەمەدا بوو کە زۆرێك لە مورشیدە سۆفییەکانی خالدی و قادری کە ئەو حەزرەتەیان لە چیاکانی سلێمانی بینیبوو یان وەسفیان لە خەڵکی ترەوە بیستبوو، دووبارە هاتنەوە حزوری پیرۆزی و سوودیان لە بوونی وەرگرت. هەروەها موفتی شاری بەغدا و کاربەدەستانی تری دەولەتی عوسمانی، زانایانی سوننی و عارف و گەورەکانی عەرەب و شازادەکانی ئێرانیش هاتنە حزوری موبارەکی و لە دیدار لەگەڵ ئەو حەزرەتە چێژی ڕووحانیان کرد. زۆرێك لە پرسیار و گرفتەکانیان لە حەزرەت کردبوو، وەڵامیان دەبیست. لەمڕووەوە ئیرادەیان بەو حەزرەتە پتر و پتر دەبوو و بەشێکی زۆریشیان باوەڕیان دەهێنا. هەرکەسێك کە دەچووە حزووری موبارەکی لە دەربڕینە شیرین و خۆشەویستانەکەی ئەو حەزرەتە وەردەچەرخا و دەگۆڕا. ئەو کەسانەی کە شانسیان هەبوو هەموو ڕۆژێك بگەنە لای، هەستیان دەکرد لە بەهەشتن. ئەوان ڕۆحێکی تازەیان دەدۆزییەوە، لەنوێوە لەدایك دەبوونەوە و لە هەموو شتێك دادەبڕان.

حەزرەتی بەهائوڵڵا، دوای گەڕانەوەی لە سلێمانی، ماوەی حەوت ساڵ لە بەغدا ژیان، لەو ماوەیەدا پلەوپایەی ڕاستەقینەی خۆی بەناونیشانی مەزهەری دەرکەوتنی نوێ بەردەوام شاردبووەوە، بەڵام خۆشەویستی و عەشقی خودایی، وەها لەو حەزرەتە وەدیارکەوت کە دڵی زۆربەیانی

مەفتون و ڕاکێشا. هیدایەتەکانی خودایی لە گفتوگۆ و ئایەت و لەوحەکانی دابەزاند، کۆمەڵگەی بابی کە چەندین ساڵ بوو بێ شوان مابونەوە، پلەبەپلە پالاوت و بێگەردی کردەوە.

لەو سەردەمە بوو کە کتێبی (ئیقان)ی دابەزاند و تێیدا چۆنییەتی دەرکەوتنە خوداییەکانی بە شێوەیەك ڕوون و شیکردوەتەوە وەسفی کردوون، بە جۆرێك کە بنەمای وەهمەکان و خورافاتی تێکشکاند.

هەر لەو کاتەدا، کاتێ کە لە کەناری ڕووباری دیجلە پیاسەی دەکرد، وشە پیرۆزەکانی (کلمات مکنونە)ی دابەزاند، ئەو وشە پیرۆزانەی کە دەتوانێت ببێتە مایەی شادی و هیدایەتی هەر یەکێکمان لە گەشە و پێشکەوتنی رووحانیدا.

ئەم خولە حەوت ساڵییەی بەغدا سەرکەوتنی شکۆمەندی بە دیاری هێنا. ئاسایی بوو کە لە ئەنجامی ئەو سەرکەوتنانە، درەنگ یان زوو چەند قەیرانێك بێنەکایەوە کە ئەویش خۆی لەخۆیدا سەرکەوتنی مەزنتری بەدواوەبێت. ئەو ناوبانگەی حەزرەتی بەهائوڵلا کە رۆژبەڕۆژ پتر دەبوو لە دیدگای دوژمنانی فەرمانی خودا شاراوە نەبوو.

چالاکترین کەس لەنێو دوژمناندا، شێخ عەبدولحسێن تەهرانی ناسراو بە شیخ ئەلعیراقیین بوو کە پەنای بردە بەر هەر هۆیەك بۆ ئەوەی کاربەدەستانی عوسمانی و حکومەتی ئێران و موجتەهیدەکان ڕازی بکات تا لە دژی حەزرەتی بەهائوڵلا ڕابپەڕن. بەڵام هەوڵەکانی شێخ کە بۆ ماوەی چەند ساڵێك درێژەی هەبوو، لە ئەنجامی دانایی و زیرەکی حەزەرتی بەهائوڵلا نەزۆك مایەوە.

بەڵام ئەو دوژمنە زاڵم و بێباکانەی فەرمانی خودا، وازیان لە دەسیسەکانی خۆیان نەهێنا لە دژی حەزرەتی بەهائوڵڵا و بەردەوام هەوڵیاندا بۆ دروستکردنی گێرەشێوێنی و خراپ نیشاندانی مەبەست و نیەتەکانی حەزرەتی بەهائوڵڵا و تا ئەوەی کە لە کۆتاییدا لە بەهاری ١٨٦٣ز هەوڵەکانیان بە ئەنجام گەیشت و قەیرانی نوێ دەرکەوت.

لە مانگەکانی کۆتایی مانەوەی لە بەغدا، حەزرەتی بەهائوڵڵا، بەردەوام لە دەربڕینەکانی خۆیدا ئاماژەی بەو تاقیکردنەوە و ئەو بەڵایانە کردوە کە هاتونەتە پێشی.

## بەشی یازدەیەم

# باخی ڕەزوان

پێنجەمین ڕۆژی نەورۆزی ساڵی (١٨٦٣ ز) لە دەرەوەی شاری بەغدا و لە مەزرایەك، جەژنێك ساز درابوو. حەزرەتی بەهائوڵڵا و ژمارەیەك لە دۆستانی خوا، لەو ڕۆژە خۆشەی بەهاردا پێکەوە بوون. هەر لەو ڕۆژەدا لەوحێك لە قەڵەمی پیرۆزیەوە نازڵ بوو و فەرمووی بۆ کۆڕەکەی بخوێننەوە. دڵی هەموان بە بیستنی ئەو لەوحە نوقمی خەم و پەژارە بوو. لەو لەوحەدا باس لەو گرفت و بەڵایانە کرابوو کە بە زوویی بەسەر ئەو حەزرەتە دێت.

دەمەو ئێوارە، سوارچاکێك بەرەو مەزرا هات و نامەیەکی بە حەزرەتی بەهائوڵڵا دا. حاکمی شاری بەغدا لەو نامەیەدا داوای چاوپێکەوتنی لە حەزرەتی بەهائوڵڵا کردبوو. سەعاتێك دواتر خێوەتەکان کۆکرانەوە. لە کاتی کۆکردنەوەی خێوەتەکاندا فەرمووی:

(ئەم خێوەتانە، وەك سفرەی بەزمی فریودەری ئەم جیهانەیە. کە بڵاوکرایەوە، دەبێ چاوەڕوانی کۆکردنەوەی بین.)

هەوڵ و نامە نووسینی زۆری ناسرەدین شا لەگەڵ حکوومەتی عوسمانی بۆ دوور خستنەوەی حەزرەتی بەهائوڵڵا بۆ شوێنێکی دوورتر، سەرەنجام بە ئەنجام گەیشت. ڕۆژی دواتر نامەی سەرۆك وەزیرانی عوسمانی بۆ حاکمی

بەغدا کە بە زمانێکی ڕێزدارانەوە نووسرابوو، پێشکەش بە حەزرەتی بەهائوڵڵا کرا. لەو نامەیەدا بانگهێشتی حەزرەت کرابوو کە سەفەر بکات بۆ ئیسلامبول پایتەختی حکوومەتی عوسمانی. هەروەها کۆمەڵێك سوارچاکیان بۆ پاراستنی ئەو حەزرەتە دابین کردبوو. حەزرەتی بەهائوڵڵا داواکاریی حکومەتی بۆ سەفەر بەرەو ئیسلامبول بە خێرایی قبووڵ کرد.

هەموو هاوڕێیان خەمبار بوون، لەبەرئەوەی دەوڵەتی عوسمانی حەزرەتی بەهائوڵڵای بۆ ناوەندی حکوومەت واتە ئیسلامبول بانگ کردبوو. ئەمە واتە هەموو پەژارەی جیهان. ئەمە واتە دووری (فیراق)...

هەموو لە ئاگردا دەسووتان. جیایی لە حەزرەتی بەهائوڵڵا شتێك بوو کە هیچ کات بیریشیان لێنەکردبوەوە. ئێستا بەخێرایی هەموو شتێك دەگۆڕا. حەزرەت لە بەغدا دەڕۆیشت. ئایا ئیتر کێ ئەوانی لە دەوری یەکتر کۆدەکردەوە و ئاسوودەیی پێدەبەخشین؟ خەمی ئەم فکرە، هەمووانی تووشی نیگەرانی کرد.

بەڵام کاتێك دەچوونە خزمەتی حەزرەت و وتەکانیان دەبیست، دیسان هەموو شتێك دەگۆڕا. سەهۆڵی خەمەکان دەتوایەوە و شادی لە دڵی هەمواندا دەگەڕا. ئامۆژگاری ئەو حەزرەتە ئەوە بوو: سەبرگرتن و خۆڕاگری. بانگەشەی فەرمان و پەیڕەو کردنی ئامۆژگاری و فەرمانەکانی خوا. ئەمە مەرهەمی راستەقینە بوو. هەر کامەیان دەبوو وەك کێو، خۆڕاگر بن و وەك گوڵ، بۆنی خۆشی خوایی بڵاوبکەنەوە.

ڕۆژی یەکەمی مانگی گوڵان گەیشت. لە نزیك بەغدا لەوبەری شط باخێکی رازاوەی پڕ لە گوڵی سوور هەبوو بە ناوی نجیبیة. حەزرەتی بەهائوڵڵا

بڕیاری دابوو پێش جێهێشتنی شار، چەند ڕۆژ لەم باخەدا بەسەرببات.

لەم ساتەوەختانەی کۆتاییدا، هەموو بێتاقەت بوون. چیتر سەبر و خۆڕاگرتن مانایەکی نەبوو. دەنگی گریان و ناڵە بەرز بووەوە. شوێنکەوتوان و خەڵکی دیکە کە لەو موسڵمانانە بوون لە دە ساڵی ڕابردوودا خۆشەویستیی حەزرەتی بەهائوڵلایان لە دڵی خۆیاندا هەست پێکردبوو، هەموو دەگریان و فرمێسکیان دەڕشت. یاران هەموو فرمێسکیان دەباراند. هەندێك بە ئارامی و هەندێك بە دەنگی بەرز. تەنانەت ئەو لەوحانەش کە حەزرەتی بەهائوڵلا بە ناوی هەر کامە لە هاوڕێیانی بەغدا، بە دەستنووسی خۆی نازڵی فەرمووبوو، بۆ ئارام کردنەوەیان بەس نەبوو.

کاتێك دەیویست لە ماڵ بێتە دەر، منداڵێکی دوو ساڵانە هاتە سەر ڕێی و داوێنی گرت و بە زمانی منداڵانە لێی پاڕایەوە کە بمێنێتەوە و نەڕوات.

فرمێسك بە چاوی حەزرەتی بەهائوڵلادا هاتە خوارەوە و دەنگی شیوەن و گریانی یاران بە ئاسمان گەیشت. ئەو حەزرەتە بە میهرەبانی و نەرمییەکی زۆرەوە منداڵەکەی لە باوەش کرد و ماچی کرد و پاشان لە ماڵ چووەدەر.

لە دەرەوەی ماڵ خەڵکێکی زۆر کۆببووەوە. ئاپۆرەی جەماوەر شەپۆلی دەدا. خەڵکی شار و دراوسێکان کە هەموویان موسڵمان بوون، کۆ ببوونەوە. لێرەش دەنگی شیوەن و گریان بەرز بوو. چەند کەس لە گەورە پیاوانی شار کە لەبەر دەرگای ماڵ وەستابوون، کڕنۆشیان برد و وتیان:

_ ئێمە پێمان وابوو کە جەنابت بۆ هەمیشە لەم شارە دەمێنیتەوە. هەربۆیە زووتر نەهاتینە خزمەتت و وا ئێستاش لەنکاو دەڕۆن؟ وەڵامی ئەو حەزرەتە بە گەورەپیاوانی شار، بزەیەك بوو و میهرەبانییەك.

بە درێژایی ئەو ڕێگایەی بە ڕووبار دەگەیشت، ئاپۆڕەی جەماوەری چاو بە فرمسێك و ناڵە و گریان شەپۆلی دەدا. ژنێك لە بنەماڵەیەکی نەجیب و ناودار (کە بە رواڵەت باوەڕی نەهێنابوو) لە ناو جەماوەردا ڕێی کردەوە و منداڵەکەی خۆی خستە بەر پێی حەزرەتی بەهائوڵڵا. ئەو بەم کارە، قوربانیی خۆی پێشکەش دەکرد. ئەو جۆرە هەستانە لە ناو خەڵکدا شەپۆلی دەدا تا ئەوکاتەی حەزرەت لە ناو گەمیەکەدا دانیشت. بە ئاشکرا دەبینرا کە عەشقی خەڵکی موسڵمان بۆ حەزرەتی بەهائوڵڵا زۆر قووڵ بوو و دژایەتیی زانایان و حکوومەت هیچ کاریگەریی لە دڵیان نەکردبوو. گوایە دانیشتوانی شار کە ئیمتیازی نزیکایەتی لە نیشانەی خوا ئەوانی گرتبووەوە، تێگەیشتنیان لە حەزرەت و بینینی گەورەیی و چاکەکاریەکانی لەو چەند ساڵەی کە لە بەغدا دەژیا، وەك قەڵغان بوو بۆ کشاندنەوە و ڕەتکردنەوەی هەموو ئەو درۆ و بوختانانەی کە زانایان و حەکیمان لە شوێنەکانی دیکەوە بۆ دژایەتی حەزرەتی بەهائوڵڵا هەڵیاندەبەست. کرداری ئەو حەزرەتە هەموانی شەیدای خۆی کردبوو، چ موسڵمانەکان و چ ئیمانداران.

چەند ساتێك پێش پەڕینەوە لە ڕووبار، ئەم وشانە لە زمانی حەزرەتی بەهائوڵڵاوە بۆ دۆستانی خوا گوترا:

(ئەی دۆستانی من، ئەم شارەی بەغدا بەمجۆرە و بەم حاڵەتەوە دەبینن، بە ئێوەی دەسپێرم و دەڕۆم. ببینن چلۆن دۆستان و خەڵکی دیکەش لە ماڵەکانیان و لە بازاڕ و شوێنەکانی هاتوچۆ کۆبوونەتەوە، وەك هەوری بەهار فرمێسك لە چاویان دەبارێ. ئێستا ئەرکی ئێوەیە کە بە کردار و ڕەفتاری خۆتان نەهێڵن ئەم ئاگرەی کە لە دڵ و دەروونی خەڵکدا بڵێسەی سەندووە، کز بێت و دامرکێتەوە.)

کۆمەڵی بابیەکان کە بەهۆی ڕێنوێنی و ڕێبەرایەتیی حەزرەتی بەهائوڵڵا بە تەواوی زیندوو ببووەوە، دیسان دەکەوتەوە ناو قۆناغی قەیرانێکی دیکە. داهاتووی ئەم ئەرکە نوێیە کە تەنیا هیوا و پاڵپشتەکەی بۆ شوێنێکی زۆر دوور لە شوێنکەوتوانی دوور دەخرایەوە، چی بەسەر دێت؟

وەڵامی حەزرەتی بەهائوڵڵا بۆ بابیە دڵ شکاوەکان کە بۆ ماڵئاوایی کۆببوونەوە، زۆر سەرسووڕهێنەر بوو. ئەو حەزرەتە ئەو پەردە و چارشێوەی کە پلەوپایەی راستەقینەی ئەوی لە چاوی خەڵك حەشار دابوو وەلانا و بە ئاشکرا فەرمووی کە ئەو هەمان موژدەی حەزرەتی باب (من یظهره الله) و موژدەی هەموو سەدە و سەردەمەکانە. هەمووان کڕنۆشیان بۆ برد و ملکەچی بەندەیی حەزرەت بوون و ئیمانیان هێنا. ئاوازی شادی و خۆشی بەرز بووەوە. جیهان بوو بە جیهانێکی دیکە و هەموو خەم و پەژارەکان بە جارێك ون بوون. بەهائوڵڵا ئاشکرا بوو.

ئەو رۆژە پڕ لە خەمانە بەم موژدەیە وەها بوون بە رۆژی شادی و خۆشی و وەها گۆڕانی بەسەردا هات کە لە جیاتی فرمێسك و گریان و ناڵین، دەنگی پێکەنین و شادی کەشی باخ و شاری بەغدای لێوانلێو کرد.

دوژمنەکان کە کەس نەبوون جگە لە زانایان و کاربەدەسەتان و راوێژکارانی دەوڵەت، هەوڵیان دابوو بە جیاکردنەوەی حەزرەتی بەهائوڵڵا لە زۆربەی یاران، گورزی کوشندە و یەکجارەکی لە ئەرکە پیرۆزەکەی بدەن. بەڵام خوا، ئەم جیاییە سووتێنەرەی بە شادی و خۆشیەکی بێسنوور گۆڕی.

راگەیاندنی پێغەمبەرایەتی، گیانێکی نوێی هێنایەوە بەبەر هاوڕێیان. ئەمە هەمان ئەو رۆژە موژدە دراوە بوو کە حەزرەتی باب، شوێنکەوتوان و

ئیماندارانی خۆی بۆ ئامادە کردبوو...

ڕۆژەکان بە شادی و خۆشییەوە لە باخەکەدا تێپەڕ دەبوون. (نبیل زرندی)، مێژوو نووسی بەهایی کە لە ڕۆژی نۆهەمەوە هەتا ڕۆژی دوازدەهەم لە باخەکە میوان بوو، بەمجۆرە دەنووسێ:

(هەموو بەیانییەك باخەوانەکان گوڵێکی زۆریان لە چوار دەوری شەقامی باخ دەچنییەوە و لە ناوەڕاستی خێوەتی پیرۆزیدا کۆی دەکردەوە. خەرمانێکی وەها لە گوڵ هەڵدەدرایەوە کە یاران بۆ چایی بەیانی دەهاتنە خزمەت حەزرەت، ئەو خەرمانە گوڵە نەیدەهێشت لەمبەر و ئەوبەر یەکتر ببینن. ئەو حەزرەتە بە دەستی پیرۆزی خۆی گوڵی بە هەموو ئەو کەسانە دەدا کە دوای خواردنەوەی چای دەڕۆیشتن. هەروەها گوڵی بۆ بنەماڵە و هەموو یارانی عەرەب و عەجەمی دیکەش دەنارد.)

نەبیل، شەوێك لە نزیك خێوەتی حەزرەت پاسەوان بوو. دەمەو بەیان حەزرەتی بەهائوڵڵا لە خێوەت هاتنە دەرەوە. وەرزی بەهار بوو و لە هەر لایەکی باخەکە دۆستانی خوا پێڵاوەکانیان خستبووە ژێر سەر و خەوتبوون. شەقامەکان پڕ بوون لە گوڵ و مانگەشەو بوو. نەبیل لە پشتەوەی حەزرەت دەڕۆیشت. چریکەی مەلانی باخ و بولبولەکان، ئەو ناوەی پڕکردبوو. لە ناوەڕاستی شەقامێکدا وەستان و رووی لە نەبیل کرد و فەرمووی:

(سەیرکە، ئەم بولبولانە کە خۆشەویستیی ئەم گوڵانەیان لە دڵدایە، هەر لە سەرەتای شەوەوە هەتا بەیانی، لە عەشقدا ناخەون. بەردەوام دەچریکێنن و دەسووتێن. چلۆنە کە عاشقانی مەعنەوی و شەیدایانی گوڵی روخساری خۆشەویستی راستەقینە لە خەودا بن؟)

ئەو سێ شەوەی کە ئەو لە باخدا بوو، هەتا بەیانی بە دەوری خێوەتی پیرۆزیدا دەگەڕا و بەردەوام ئەو حەزرەتەی لە خێوەتدا بە بێداری دەبینی. ئەو سەری سووڕمابوو کە شەو هەتا بەیان ناخەوێ و رۆژ هەتا شەو، هێندە ئیمانداران و گەورە پیاوانی شار لە بەغداوە دێن و بە خزمەت دەگەن، ئەو حەزرەتە بەردەوام بەپێوەیە و بەیان دەفەرموێ، ئەی کەواتە کەی دەحەسێتەوە؟

دوانزە رۆژ تێپەڕی. کاتی تێپەڕین بە باخدا، کاتێك ئەسپیان هێنا تا حەزرەت سوار بێت، جەماوەر کەوتەڕێ، وەها کە دەتگوت ئەسپ بەسەر جەماوەردا دەڕۆیشت.

حەزرەتی بەهائوڵڵا لە بەغداوە وەڕێ کەوت لەحاڵێکدا کە موژدە و بەڵێنی پێشینانی پیرۆز و پێغەمبەران و ئەولیا وەدی دەهات. ئەو حەزرەتە وەڕێ کەوت، لەحاڵێکدا کە کۆمەڵێك گەورە و بچووك هاوڕێیەتیان دەکرد. وەڕێ کەوتن، لەحاڵێکدا کە سەد رۆژ سەفەری وشکایی و سەر دەریای لەبەر بوو.

حەزرەتی بەهائوڵڵا و بنەماڵەکەی بە هاوڕێیەتیی کۆمەڵێکی بچووك لە یاران تەنیا چوار مانگ لە ئیسلامبول مانەوە. حکوومەتی ئێران، لە دوورەوە بەردەوام بوو لەسەر ئازاری کەسێك کە ئێستا بە ئاشکرا وەك رێبەری بزووتنەوەی بابیەت ناسرابوو. باڵیۆزی ئێران لە بارەگای سوڵتانی عوسمانی پیلان و هێرشێکی رێکخراوی لە دژی حەزرەتی بەهائوڵڵا دەستپێکرد. لەو سەردەمدا سوڵتانی عوسمانی و وەزیرەکان و کەسانی دەوروبەری لە چوارچێوەیەکی لێوانلێو لە خیانەت، پیلانگێڕی و ڕیاکاری دەژیان. حەزرەتی بەهائوڵڵا خۆی دەپاراست لە پەیوەندی لەگەڵ ئەم خەڵکە ناپاکە.

ئەم خۆپاراستنەی حەزرەتی بەهائوڵڵا لە خەڵکی کۆشك، ڕێگای بۆ باڵیۆزی ئێران خۆشتر کرد هەتا لە زەینی سوڵتانی عوسمانی و وەزیرەکانی بە بوختانی ناڕاست و بێبنەما، ئاڵۆز بکات.

هەوڵی بەردەوامی باڵیۆزی ئێران، سەرەنجام کاریگەر بوو و بڕیاری دوور خستنەوەی ئەو حەزرەتەی بۆ شاری (ئەدرنە) پەسند کرد، شارێك کە زۆر لە سنوورەکانی ئێرانەوە دوور بوو.

وەڵامی حەزرەتی بەهائوڵڵا بۆ ئەم بڕیارە ئەوە بوو کە خێرا لەوحێکی درێژی بۆ سوڵتانی عوسمانی نازڵ فەرموو و تێیدا ڕەخنەی لە سوڵتان و وەزیرەکان گرت و بەتوندی سەرکۆنەی کردن و بە ئاشکرا نەشیاویی ئەوانی باس کرد. لەوحی پیرۆز لە پاکەتێکی مۆر کراودا، درایە سەرۆك وەزیرانی پاشا. کاتێك نامەکەی کردەوە و دەستی بە خوێندنەوەی کرد، ڕەنگی سپی هەڵگەڕا و وتی: (زمانی ئەم نامەیە وەهایە کە پاشایەکی بەهێز و دەسەڵات، ڕوو لە یەکێك لە خزمەتکارانی خۆی بکات و ڕەخنە لە ڕەفتار و کرداری بگرێت.)

## بەشی دوازدەیەم

# لە پایتەختی عوسمانییەوە هەتا ترسناکترین زیندان

مەودای نێوان ئیسلامبول هەتا ئەدرنە، یەکێکی دیکە لە شارەکانی عوسمانی لە چەند سەد کیلۆمەترێك زیاتر نییە. بەڵام ئەم سەفەرە، دوازدە رۆژی درێژە کێشا و ئەو ماوەیە بۆ حەزرەتی بەهائوڵڵا و بنەماڵەکەی کە سێهەم جار بوو دوور دەخرانەوە، زۆر ناخۆش و پڕگرفت بوو. ئەم سەفەرە لە مانگی سەرماوەز و لە سەرمای زستاندا بوو. زۆربەی دوورخراوەکان جلوبەرگ و کەرەستەی پێویستیان بۆ پاراستن لە سەرما نەبوو. تەنانەت بۆ ئاو هەڵێنجان لە کانی دەبوو ئاگر بکەنەوە هەتا سەهۆڵ وردە وردە بتوێتەوە و ببێتە ئاو.

حەزرەتی بەهائوڵڵا رۆژی ١٢ی سێپتەمبری ١٨٦٣ ز گەیشتە شاری ئەدرنە و بۆ ماوەی ٤ ساڵ و ٩ مانگ لەو شارە ژیا.

ئەم قۆناغە سەرەتای یەکێك لە پڕئازارترین قەیرانەکان و شکۆمەندترین سەرکەوتنەکان بوو بۆ ئایینی بەهایی. هەرچی دەستڕۆیشتوویی و خۆشەویستیی حەزرەتی بەهائوڵڵا زیاتر دەبوو، ئاگری کینەش لە دڵی میرزا یەحیادا زیاتر بڵێسەی دەسەند و لە دوژمنایەتی و دژایەتیی لەگەڵ حەزرەتی بەهائوڵڵادا سوورتر دەبوو. ئەو زۆر هەوڵیدەدا و تێدەکۆشا هەتا بابییەکان

له قبووڵکردنی حەزرەتی بەهائوڵڵا وەك (مەزهەری دەرکەوتنی) بەڵێندراو له کتێبی بەیاندا پاشگەز بکاتەوە.

ئەو گرفت و کێشانەی که میرزا یەحیا دەیهێنایە ئاراوە، نەك تەنیا کاریگەریی کردە سەر کۆمەڵی بەهایی، بەڵکوو دەرفەت و بیانووشی بە دوژمنانی دەرەکی دا تا هێرشی زیاتر و توندتر له دژی حەزرەتی بەهائوڵڵا و شوێنکەوتوانی دەستپێبکەن. هەڵخڕاندن و فریوکاریەکانی میرزا یەحیا هیچ سنووری نەبوو. تەنانەت بڕیاریدا حەزرەتی بەهائوڵڵا ژەهرخوارد بکات و سەرەنجام بڕیارەکەشی جێبەجێ کرد...

کاریگەریی ژەهرەکە لەسەر جەستەی حەزرەتی بەهائوڵڵا گەلێك زۆر بوو. ئەگەرچی ئەو حەزرەتە رزگاری بوو، بەڵام بەهۆی کاریگەریی ژەهرەکە، لەرزەیەك کەوتە دەستە پیرۆزەکانیی که ئاسەوارەکەی هەتا کۆتایی ژیانیش هەر مایەوە.

گێرانەوەی قۆناغی ئەدرنە نەك لەبەر دوژمنکارییە جێی شەرمەکانی یەحیا، بەڵکوو بەهۆی ئەو سەرکەوتنە گەورانەوەیە کە لەو سەردەمەدا بۆ امر الله دەستەبەر بوو. لەم شارەدا بوو کە حەزرەتی بەهائوڵڵا گەلێك لەوح و نامەی بۆ پاشا و سەرۆکەکانی جیهان نازڵ فەرموو و فەرمانی خوای بە دوور و نزیك ڕاگەیاند.

ئەم ڕاگەیاندنە گشتییەی فەرمانی خوا، سێهەمین قۆناغی ڕەوتی وردە وردەی دەرکەوتنی ئەمری حەزرەتی بەهائوڵڵا بوو.

یەکەمین قۆناغ لە سیاهچاڵی تاراندا سەری گرت. کاتێك روح القدسی خوایی

بۆ حەزرەتی بەهائوڵڵا نازڵ بوو و پێیڕاگەیاند کە هەڵگری پێغەمبەرایەتی و پەیامی خوایە بۆ ئەمڕۆ. هەرچەندە لەم قۆناغە کورتەدا، دەرکەوتنی نوێ ئاشکرا نەبوو، بەڵام وردەوردە خەڵکی بەتوانا بۆ ناسینی حەزرەتی بەهائوڵڵا ئامادە بوون. دووهەمین قۆناغ لە باخی رضوان ڕوویدا و حەزرەتی بەهائوڵڵا ئەرك و پەیامی خۆی بە ژمارەیەك لە ئیمانداران ڕاگەیاند کە بۆ ماڵئاوایی لەگەڵ حەزرەت کۆببوونەوە و بەمجۆرەش هەندێك لە یارانی بژاردە، لە پلەوپایەی ئەو حەزرەتە ئاگادار بوونەوە. سێهەمین قۆناغ، ڕاگەیاندنی گشتیی پەیامی ئەو حەزرەتە بوو کە لە ئیسلامبول دەستیپێکرد و لە ئەدرنە هێزی گرت و لە عەکا، شوێنی دواتر و دواین تاراوگەی ئەو حەزرەتە، گەیشتە ئەوپەڕی هێزی خۆی.

دژایەتیی ئاشکرای میرزا یەحیا لەگەڵ جوانیی خوایی لە ئەدرنە، بووە هۆی شێواندنی بیروڕای یاران. ژمارەیەکی زۆر لەو ئیماندارانە هێشتا پلەوپایەی حەزرەتی بەهائوڵڵایان بە باشی دەرك نەکردبوو و ئەم دۆخە بۆ دوژمنان دەرفەتێکی لەبار بوو هەتا گورزی دیکە لە جەستەی ئایینی نوێی خوا بوەشێنن.

بەرەبەیانی ڕۆژێك، پیاوانی حکوومەت بە بڕیارێك کە لە ئەنجامی ڕێککەوتنی دەوڵەتەکەیان لەگەڵ دەوڵەتی ئێران درابوو، بەبێ ئاگادارکردنەوەی پێشووتر، ماڵی حەزرەتی بەهائوڵڵایان گەمارۆدا و پێیانڕاگەیاندن کە خۆیان بۆ ڕۆیشتن ئامادەبکەن.

هەتا ماوەیەك، کەس نەیدەزانی چ چارەنووسێك چاوەڕێیان دەکات. گەورەترین نیگەرانی و ترسی یاران ئەوە بوو کە لە خۆشەویستیەکەیان جیا

ببنەوە. دەنگۆی ئەوە بڵاو کرابووەوە کە حەزرەتی بەهائوڵڵا و بنەماڵەکەی بۆ لایەك دوور دەخەنەوە و خەڵکەکەی دیکەش، لەبەر یەك بڵاودەبن.

سەرەنجام دەرکەوت کە حەزرەتی بەهائوڵڵا بۆ عەکا لە ناوچە پیرۆزەکان و میرزا یەحیا بۆ دورگەی قوبرس کە بەشێك لە وڵاتی عوسمانی بوو دوور دەخرێنەوە. زۆربەی تاراوگەنشینان کە ژمارەیان نزیك بە ٧٠ کەس دەبوو ــ و دوو هاوکارە خراپەکارەکەی میرزا یەحیاشیان لەگەڵ بووــ بۆ عەکا بەرێ کران و چوار کەس لە هاورێیانی حەزرەتی بەهائوڵڵا لەگەڵ گرووپی میرزا یەحیا بۆ قوبرس دوور خرانەوە.

حەزرەتی بەهائوڵڵا و هاورێیانی لە رۆژی ١٢ی ئاگۆستی ١٨٦٨ ز ئەدرنەیان جێهێشت و دوای سەفەرێکی سەخت و دژوار، لە رێگای دەریا و وشکانییەوە لە رۆژی ٣١ی ئاگۆست گەیشتنە شاری عەکا.

دانیشتوانی عەکا عادەتیان بە هاتنی زیندانی بوو، لەبەر ئەوەی عەکا شارێك بوو کە دەوڵەتی عوسمانی کردبووی بە تاراوگەی تاوانباران و ئاژاوەچیان. ئەمجارەیان پێیان وترابوو کە زیندانییەکان، دوژمنانی دەوڵەت و خوا و ئایینی ئیسلامن. سوڵتان عەبدولعەزیز بڕیاری دابوو هەتا لە ناخۆشترین و قورسترین زیندانیدا رایانگرن. ئەو وەزیرەکانی هیوادار بوون کە توندوتیژی و گرفت و نالەباریی دۆخی زیندانی عەکا، ببێتە هۆی لەناو چوونیان.

دەقی فەرمانی سوڵتان لە مزگەوتی جامیعی شار بە دەنگی بەرز خوێندرایەوە و هەموو خەڵك ئاگادار بوونەوە کە ئەم ئێرانیانە، بە زیندانی هەتاهەتایی حوکم دراون و هەرچەشنە دانوستان و هاتوچۆ کردن لەگەڵیان قەدەغەیە.


Tehran
Baghdad
'Akká
Haifa
Constantinople
Adrianople
BLACK SEA
CASPIAN SEA
ARAL SEA
MEDITERRANEAN SEA
ADRIATIC S.
RED SEA
PERSIA
PERSIAN G.
G. of Oman
Arabian Desert
Libian Desert
Ottoman Empire
Iran

دوای دابەزین لە کەشتی لە بەندەری عەکا، دوورخراوەکانیان گواستەوە بۆ سەربازخانەیەکی چۆڵکراو و لەو بەشەی کە دیاری کرابوو، زیندانی کران.

شەوی یەکەم هەموویان لە ئاو و خواردن بێبەش کران و دوای ئەو بۆ هەرکامەیان ڕۆژانە سێ نانی ڕەش و سوێریان وەك بەش دیاری کرد. زۆر زوو هەموو زیندانییەکان جگە لە دوو کەس، نەخۆش کەوتن و لە جێدا کەوتن و سێ کەسیشیان هەر لە ڕۆژەکانی یەکەمدا، ماڵئاواییان لە ژیان کرد. هەرچەندە کە وردەوردە دۆخی زیندانییەکان هەندێك باشتر بوو بەڵام ساڵەکانی یەکەمی قۆناغی عەکا بۆ حەزرەتی بەهائوڵڵا قۆناغێکی زۆر ناخۆش و سەخت و دژوار بوو.

ئەو زیان و بەڵایانەی کە حەزرەت لە زیندانی سیاهچاڵی تاران تووشی بوو، تەنیا لە لایەن دوژمنانی دەرەوەی امر الله بوو. ناخۆشی و گرفتەکانی ئەدرنە لە لایەن دوژمنانی ناوخۆی کۆمەڵی بەهایی بوو. بەڵام قەیرانی ساڵەکانی یەکەمی عەکا، ئەنجامی کردار و کارەکانی هەردوو لای دوژمنانی ناوخۆ و دەرەوە بوو.

سەرەڕای بڕیاری ئاشکرای سوڵتان، بۆ ئەوەی کەس بۆی نییە لەگەڵ حەزرەتی بەهائوڵڵا و هاوڕێیانی هەڵسوکەوت بکات، کۆمەڵێك لە بەهاییەکان بە پێ لە ئێرانەوە بە مەبەستی زیارەت و بینینی خۆشەویستەکەیان و بە هیوای ئەوەی کە لەوانەیە بتوانن بە خزمەتی بگەن، سەفەریان کرد. ئەم خەڵکە پاك و بەوەفایە کە بەهۆی لەمپەر و کۆسپەکانی ناو زیندانەوە نەیانتوانی بگەنە خزمەتی حەزرەت، هەر بەوەندە شاد و سوپاسگوزار بوون کە لە ڕێگای دوورەوە، لە بەرانبەر سەربازخانە بوەستن و لە پشتەوەی

میلەی پەنجەرەکان، خۆشەویستەکەیان بۆ ساتێك زیارەت بکەن. جوڵەیەکی دەستی حەزرەت بۆ ئەوانەی چەندین مانگ ڕێگایان بڕیبوو، پاداشتێکی تەواو بوو و زۆربەیان لەم شانازییەی کە پێیان دەبڕا شاد و لێوانلێو لە هێزی رووحانی دەگەڕانەوە نیشتمانی خۆیان و ئەزموونەکانی خۆیان بۆ خەڵکی دیکە باسدەکرد.

خەمبارترین ڕووداوی ئەم قۆناغە، کۆچی ناوادەی کوڕی حەزرەتی بەهائوڵڵا، بەڕێز میرزا مەهدی ناسراو بە (غصن اطهر) بوو. (غصن بە واتای لق و پۆپ بە کوڕەکانی حەزرەتی بەهائوڵڵا دەوترێت کە وەچەی راستەقینە بوون). ئەو کاتێك کە لەسەر سەربانی سەربازخانە پیاسەی دەکرد و سەرقاڵی دوعا و پاڕانەوە بوو، لە کلاوڕۆژنەی میچەکەوە بەربووەوە و کەوت بەسەر سندووقێکی دارینی ناو ژوورەکەدا و بە توندی بریندار بوو. خێرا پزیشکیان هێنایە سەری، بەڵام کارێك نەدەکرا. باوکی بەڕێزی پرسیاری لێکرد کە چ ئاواتێکی هەیە. وتی: (ئاواتەخوازم بەهاییەکان بتوانن بێنە خزمەتتان و بە دیدارتان شادبن.) حەزرەت فەرمووی: (وەها دەبێت. خوا ئاواتەکەت وەدی دێنێت.) ئیتر کاتی خۆی بوو... دوای ٢٢ سەعات، بە لێوی بە بزەوە و دڵنیا لە وەدیهاتنی ئاواتەکەی، بەرەو بارەگای خوا هەڵکشا.

دوای کۆچی دوایی کوڕەکەی حەزرەتی بەهائوڵڵا، ناخۆشیەکان کەم بوونەوە و دەرگای زیندان کرایەوە بەڕووی ئەو ئیماندارانەی هەزاران کیلۆمەتریان ڕێگا بڕیبوو هەتا بە عەکا بگەن ...

ئێستا دوای دوو ساڵ، بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە سوپای عوسمانی پێویستی بە سەربازخانەکە بوو، بڕیار درا حەزرەتی بەهائوڵڵا و هاوڕێیانی،

شوێنەکە چۆڵبکەن. دوای ئەوە لەگەڵ بنەماڵەکەی بۆ چەندین ماڵ گواسترانەوە _هەر کامەیان بۆ ماوەیەکی کورت_ هەتا ئەوەی کە سەرەنجام گواستیانەوە بۆ ئەو ماڵەی کە ئەمڕۆ بە (ماڵی بەندەکان) (بیت عبود) دەناسرێتەوە. بەڵام هێشتا بڕیار و فەرمانەکانی سوڵتان توند بوو و ئەو حەزرەتە هەروا لە ژێر چاودێریدا بوو و دانیشتوانی شار، ئەوپەڕی دوژمنایەتی و دژایەتیان دەنواند.

بە تێپەڕبوونی کات، خەڵکی عەکا کە زۆربەیان موسڵمان بوون، لە بێتاوانیی ئەم گرووپە تاراوگەنشینە ئێرانییە تێگەیشتن و هەندێك لە کەسانی دڵپاك دەرکیان بە پلەوپایەی حەزرەتی بەهائوڵڵا کرد و ئیمانیان هێنا. دۆخی زیندانیش وردەوردە باشتر بوو. بەشی هەرە زۆری ئەم گۆڕانکاری و ئاڵوگۆڕە، ئەنجامی هەوڵ و کارەکانی حەزرەتی عەبدولبەها کوڕەگەورەی حەزرەتی بەهائوڵڵا بوو کە بەردەوام لەگەڵ دانیشتوانی شاری عەکا لە پەیوەندیدا بوو و توانی مەبەستی ڕاستگۆیانەی بەهاییەکان و رووحی ئامۆژگاریەکانی نیشانەی پاکی خودایی ئاشکرابکات.

سەرەنجام حەزرەتی بەهائوڵڵا توانی لە شاری عەکا بێتەدەر و لە ماڵێك لە قەراغ شار نیشتەجێ بێت. دوای ماوەیەکی زۆر زیندانی بوون لە چوارچێوەی دیوارە ڕووخاوەکانی شاردا، ئێستا حەزرەتی بەهائوڵڵا دەیتوانی چەند ساتێك لە دەرەوەی شار بێت و لە سەوزایی و جوانی سروشت کە زۆری پێخۆش بوو، چێژ وەرگرێت.

دەبێ لەبیرمان بێت کە هەرچەندە بەڵا و گرفت و ناخۆشییەکانی حەزرەت بە زیندانی گەورەدا زۆر توند بوو، بەڵام دوور خستنەوەی ئەو حەزرەتە بۆ عەکا

بووە هۆی وەدیهاتنی بەڵێنەکان و موژدەکانی کتێبە پیرۆزەکانی پێشووتر سەبارەت بە سەرهەڵدانی نیشانەی گشتیی خوایی.

لە عەکا بوو کە خۆری حەقیقەت لە ماوەی ٢٤ ساڵدا لەوپەڕی شکۆ و گەورەیی خۆی درەوشایەوە. لەم ماوەیەدا بوو کە حەزرەتی بەهائوڵڵا شاخی (کرمل)ی لە شاری حەیفا بە پێی پیرۆزی خۆی پیرۆزکرد و ئەو شوێنەی بە حەزرەتی عەبدولبەهای کوڕی نیشاندا کە دەبوو دواتر تەرمی پاکی حەزرەتی باب لەوێ دابنرێت و شوێنگەی بەرز بنیات بنرێت.

دواین ساڵەکانی ژیانی حەزرەتی بەهائوڵڵا، نیشانەی خوا لەم سەردەمەدا، لەو بینا گەورەیەدا تێپەڕ بوو کە بە (کۆشکی بەهجی) ناسراوە و لە دەرەوەی عەکا دروست کراوە. ئەم کۆشکە ساڵانێك پێش هاتنی حەزرەتی بەهائوڵڵا بۆ ناوچەی پیرۆز لە شاری عەکا دروست کرابوو و خاوەنەکەی بەهۆی بڵاو بوونەوەی نەخۆشی، لەگەڵ بنەماڵەکەی جێیان هێشتبوو. حەزرەتی بەهائوڵڵا توانی سەرەتا ئەو کۆشکە بە کرێ بگرێت و پاشان بۆ ژیان و مانەوەی باوکی بەڕیزی، بیکڕێتەوە.

سوڵتان عەبدولعەزیز خەلیفەی عوسمانی و دوو وەزیرە ستەمکارەکەی (فواد و عالی پاشا) کە بوونە هۆی زیندانی کردن و دەستبەسەر کردنی نیشانەی امر الله و گومانیان دەکرد کە بۆ هەمیشە ئەم ئاگرە دەکوژێتەوە، ئێستا لەوپەڕی سووکیدا لەم جیهانەدا نەمابوون.

تا ئەوکاتە، نەك هەر خەڵکی عەکا، بەڵکوو خەڵکی ناوچەکانی دەوروبەریش کە زۆربەیان موسڵمان بوون، رەفتار و هەڵسوکەوتی خۆیان لەگەڵ حەزرەتی بەهائوڵڵا و یارانی بە تەواوی گۆڕیبوو. هەرچەندە فەرمانە توند و قورسەکەی

سوڵتان هێشتا دەڕۆیشت و حەزرەت بە ڕەسمی هێشتا زیندانی بوو، بەڵام لە ڕاستیدا وەك پاشایەك جێگای ڕێز و حورمەت بوو. تەنانەت حاکمی شار و کاربەدەستانی پایەبەرزی ئایینی و مەدەنیی ئەو ناوچەیە، بۆ ڕێنوێنی و ڕاوێژ دەهاتنە خزمەتی حەزرەت. ئەمەیە دەسەڵات و هێز و گەورەیی دەرکەوتنی نیشانی خوا کە دڵان دەتەنێتەوە و دەیانگۆڕێت.

لە قەڵەمی حەزرەتی بەهائوڵڵا لە سەردەمی عەکا و بەهجی، هەروەك سەردەمی ڕابردوو، هەزاران بەیانی هەڵگری ئامۆژگاریەکانی خوا، بۆ سەقامگیرکردنی شارستانییەتێکی گەورە و بەشکۆ لە جیهاندا، نازڵ بوو.

پەرەسەندنی بەرینی فەرمانی نوێی خوا لە ڕۆژئاوا، کە تۆوەکەی لە سەردەمی ژیانی حەزرەتی بەهائوڵڵادا چێنرابوو، بەکردەوە لە سەردەمی حەزرەتی عەبدولبەها کوڕەگەورەی حەزرەت ڕوویدا. بنەما و ئامۆژگاریەکانی حەزرەتی بەهائوڵڵا هەر لە کاتی ژیانیدا گەیشتە وڵاتانی رۆژئاوا و ژمارەیەکی کەم لە خەڵکی ئەوبەری دەریاکان، لە زیندانکراوەکەی عەکا و کاریگەریی ئەو حەزرەتە لەسەر ئەو کەسانەی دێنە دیداری، ئاگادار بوونەوە. لەم ناوەدا دەبینرا کە هەندێك لە موسڵمانانی دانیشتووی ئەو ناوچانە دوای تێپەڕبوونی زەمەن، زۆر سەیر لە دڵەوە هۆگری حەزرەت بوون و ژمارەیەکیشیان ئیمانیان هێنا. گەورەیی و خۆشەویستیی حەزرەتی بەهائوڵڵا وەها چووبووە ناو دڵی خەڵکی ئەو شارە کە تەنانەت زۆربەیان دانیان پێدادەنا کە ئەو گۆڕانکاریەی لە کەشوهەوای شارەکەیاندا ڕوویداوە و خۆشی کردووە، بەهۆی بوونی پیرۆزی حەزرەتی بەهائوڵڵایە.

لە بەهاری ساڵی ١٨٩٠ز و لە کۆتاییەکانی ژیانی حەزرەتی بەهائوڵڵا، ڕۆژهەڵاتناسی ناوداری بریتانیایی (ئیدوارد.ج.براون) (Edward G. Brown) هاتە دیداری حەزرەت. ئەو سەبارەت بەم دیدارە مێژووییە دەنووسێت:

(... ڕێنوێنەکەم هەندێك وەستا هەتا من پێڵاوەکانم داکەند، پاشان زۆر خێرا پەردەکەی لادا و دوای ئەوەی من لە دەرگا چوومە ژوور پەردەکەی داداوە. خۆمم لە ژوورێکی گەورەدا بینییەوە کە لای سەرەوەی ریزە کورسیەکی نزمی تێدا دانرابوو. لە بەشی بەرانبەر بە دەرگاکە، دوو یان سێ کورسی دانرابوو. سەرەڕای ئەوەی پێشتر تاڕادەیەك دەمزانی بۆ کوێ دەچم و دەچمە زیارەتی چ کەسێك، بەڵام گەورەیی و ڕێزداریی ئەو شوێنە خستمیە دڵەکوتێ و چەند چرکەیەك تێپەڕی هەتا توانیم بێمەوە خۆ و تێبگەم کە لەو ژوورەدا بە تەنیا نیم. لە سووچێکی ژوورەکەدا، ئەو جێیەی کورسیەکان بە دیوارەکەوە لێکنرابوون، جەستەیەکی بەڕێز لەوپەڕی گەورەییدا، لەحاڵێکدا کە وەك دابونەریتی دەروێشەکان تاجێکی لەسەر نابوو (بەڵام بەرزتر و بە شکڵێکی جیاوازتر) و جامانەیەکی سپی و بچووکی لێوە پێچابوو کە سەری پیرۆزی دادەپۆشی، دانیشتبوو. دوو چاوی کاری دەکردە سەر قووڵایی رووحی مرۆڤ و لە ناوچاوانییەوە هێز و دەستەڵات و گەورەیی دیار بوو. هێڵە قووڵەکانی نێوچاوانی نیشانەی پیری بوون، بەڵام قژ و ڕیشی رەش و پڕی تێکئاڵاو بوو و گەیشتبووە نزیك پشتێنی، بەپێچەوانەی ئەوە بوو. مەپرسە لە بەرانبەر چ کەسێکدا وەستام و سەری ڕێز و ستایشم بۆ کامە سەرچاوەی پاکی و عەشق دانەواند کە پاشاکانی جیهان ئێرەیی پێ دەبەن و ئیمپراتۆرەکان حەسرەتی بۆ دەخۆن. دەنگێکی نەرم و لەسەرخۆ ئیزنی دانیشتنی پێدام و پاشان فەرمووی:

(سوپاس بۆ خوا کە بەهرەمەند بووی... هاتوویەتە دیداری زیندانییەکی دوورخراو و تاراوگەنشین... ئێمە جگە لە چاکسازیی جیهان و بەختەوەریی خەڵك مەبەستێکمان نییە، بەم حاڵەوە ئێمەیان بە شەڕاشۆ و گەندەڵ ناودێر کردووە و بە شیاوی زیندان و دوورخستنەوەمان دەزانن... ئایا ئەگەر هەموو هۆز و نەتەوەکان لە ژێر سێبەری ئایینێکدا کۆببنەوە و هەموو خەڵك وەك برا بن، پەیوەندیی خۆشەویستی و یەککگرتووانە لە ناو مرۆڤدا پتەو بێت و جیاوازی و کێشەی ئایینی نەمێنێت و جیاوازی ڕەگەزی بسڕدرێتەوە، چ عەیب و زیانێکی هەیە؟... بەڵێ دیارە هەروا دەبێت. ئەم شەڕە بێ ئاکام و سووتێنەرانە کۆتایی دێت و ئاشتی وەدیدێت. ئایا ئێوەش لە ئەوروپا پێویستیتان هەر بەمە نییە؟ ... و ئایا هەر ئەوە نییە کە حەزرەتی مەسیح موژدەی داوە؟ ... سەرەڕای ئەوەش دەبینین کە پاشاکان و کاربەدەستانی ئێوە، لە جیاتی ئەوەی خەزێنەکانیان بۆ بەختەوەری و ئاسوودەیی مرۆڤ تەرخان بکەن، سەرەڕۆیانە بۆ دابینکردنی کەرەستەی لەناوبردن و سڕینەوەی مرۆڤ بەکاری دەهێنن. ئەم شەڕ و کوشتن و ناکۆکیانە دەبێ کۆتایی پێبێت و مرۆڤ وەك هۆز و بنەماڵەیەکی لێبێت. شانازی بەوە نییە کە تەنیا نیشتمانەکەی خۆتان خۆشبوێت، بەڵکوو شانازی ئەوەیە کە هەموو جیهانتان خۆشبوێت.)

لە ماوەی ئەو ساڵانەی کە (نیشانەی پاك)ی خوا لەم جیهانەدایە و لەناو خەڵکدا دەژی، هێزی سەرسووڕهێنەری ئەو لە هەموو جیهاندا کاریگەر دەبێت و دەبێتە هۆی گۆڕانکاری و گۆڕینی گشتی لە حەقیقەتەکانی هەموو بوونەوەراندا. لەم سەردەمە پڕ شکۆیەی ئێستادا، حەزرەتی بەهائوڵڵا

وشەی خوایی (کلمة الهیة) (بریتی لە ئامۆژگاری و پەروەردەی ئاسمانی) بۆ جیهانی مرۆڤ لە ماوەی ٤٠ ساڵدا نازڵ کرد و هێز و توانای لەبن نەهاتووی لەم جیهانەدا بە ئەمانەت دانا کە دەرکەوتن و کارکردنیان دەبێتەهۆی دامەزراندنی شارستانییەتێکی خاوەنشکۆ و چاوەڕواننەکراو.

نازڵ بوونی بەردەوامی وەحیی خوا بۆ ماوەی ٤٠ ساڵ، سەرەنجام لە ٢٩ی ئایاری ١٨٩٢ز کۆتایی پێهات.

نۆ مانگ پێش ئەوە، حەزرەتی بەهائوڵڵا فەرمووبووی کە حەز دەکات ئەم جیهانە جێ بهێڵێت و لە هەمان ڕۆژەوە لە فەرموودەکانییەوە بە ئاشکرا دیار بوو کە ژیانی پیرۆزی لەسەر ئەم جیهانە خۆڵینە بەرەو کۆتاییە.

شەوی ٨ی ئایاری ١٨٩٢ز تایەکی کەم هاتە لەشی پیرۆزیەوە و سەرەڕای ئەوەی رۆژی دواتر زۆر زیاتر بوو، بەڵام زۆر زوو تایەکەی نیشتەوە. هەربۆیە ئیزنی دیداری بە هەندێك لە خۆشەویستان و یاران فەرموو بەڵام هێندەی پێنەچوو کە دەرکەوت تەندروستیی حەزرەت تەواو نییە. دیسان تا زیادی کرد... لەگەڵ سپێدەی ٢٩ی ئایاری ١٨٩٢ز لەحاڵێکدا کە تەمەنی پیرۆزی لە ٧٥ ساڵ تێدەپەڕی، ئەو ڕووحە پیرۆز و پاکە، بەرەو جیهانی سەرەوە هەڵکشا.

شەش رۆژ پێشتر، حەزرەتی بەهائوڵڵا، هاوڕێیانی لە دەوری خۆی کۆکردەوە کە لە کۆشکی بەهجی نیشتەجێبوون و ئەمە دوایین شانازیی بە خزمەت گەیشتنی خۆشەویستان بوو.

لەحاڵێکدا کە جەستەی پیرۆزی لە ناو جێگادا پاڵی بە یەکێك لە منداڵەکانییەوە دابوو، ڕووی لە ئامادەبووان کرد و فەرمووی:

(لە هەمووتان ڕازیم. زۆرتان خزمەت کرد و زەحمەتی زۆرتان کێشا. هەموو بەیانییەك هاتن و هەموو ئێوارەیەك هاتن. هەمووتان سەربەرز و سەرکەوتووبن لەپێناو یەکگرتوویی و بەرزکردنەوەی فەرمانی خوای جیهان ...)

فرمێسکی خەم بە چاوی دانیشتوانی دەوروپشتی جێگاکەیدا هاتەخوار. وشەکانی حەزرەت بە ئاشکرا بۆنی جیایی و دووری لێدەهات...

هەواڵی کۆچی دوایی حەزرەتی بەهائوڵڵا بە خێرایی بە تەلەگرافێك بەم دەقەوە (قی أفلت شمس البهاء) (خۆری بەها ئاوا بوو) بۆ سوڵتان عەبدولحەمید، خەلیفەی عوسمانی نێردرا و هەروەها ئاگادار کرایەوە کە گۆڕی پیرۆزی لە نزیکیی کۆشکی بەهجی دەبێت.

ژوورێکی بچووك لە ڕۆژئاوای کۆشکەکە هەڵبژێردرا و ڕێوڕەسمی بەخاکسپاردنی هەر ئەو ڕۆژە، دوای ڕۆژئاوابوون بەڕێوەچوو. ئەو شوێنە پیرۆزە بووە قیبلەی بەهاییەکان. بەمجۆرە گۆڕی حەزرەتی بەهائوڵڵا لە قەراغ شاری عەکا، بوو بە پیرۆزترین شوێنی سەر گۆی زەوی بۆ بەهاییەکان و قیبلەی ئایینی بەهایی دامەزرا.

نەبیل مێژوونووسی بەهایی، ئەو ڕۆژگارە پڕ لە خەم و تاڵی و ناسۆرەی بەمجۆرە نووسیوەتەوە:

(لە گەرمەی ئەو مەحشەرە گەورەیەدا هەموو دانیشتوانی عەکا و دەوروبەری لە دەشتەکانی دەوری کۆشکی پیرۆز، چاو بە گریان و شینگێڕ بوون.

بیست و چوار ساڵ پێشتر، ئەو ڕۆژەی حەزرەتی بەهائوڵڵا و بنەماڵەکەی و هاوڕێیانی لە کەشتی دابەزین و پێیان نا سەر کەناری شاری عەکا، خەڵکێك

بۆ سەیر کردن هاتبوون. دەنگی هاوار و سووکایەتی کردنیان گەلێك بە ئازار بوو. ئەوان زیندانییە تازەکانیان وەك کۆمەڵێك بەندکراو دەبینی کە شایانی هەرچەشنە ئازار و سووکایەتیەك بوون...

ئەمڕۆ لە ڕێوڕەسمی بەخاکسپاردنی ئەو زیندانییەدا، هەموو خەڵکی شاری عەکا و شارەکانی دەوروبەر، لە خەڵکی ئاسایی و زانا و حاکم و دادوەر و بازرگان و پیر و لاو و ژن و پیاو لە دەشتی دەوری کۆشکی بەهجی، دەگرین و شیندەگێڕن و بە سەری خۆیاندا دەدەن...

هەر لەم ڕێوڕەسمەدا بوو کە نەك تەنیا ژمارەیەکی زۆر لە گەورە پیاوانی مەزهەبی شیعە، سوننە، مەسیحی، جوولەکە و هتد لە شارە دوورەکانەوە ئامادەبوون، بەڵکوو هەرکامەیان بە زمانی خۆی داخ و پەژارەی خۆیان لە قووڵایی دڵەوە بەوپەڕی ڕێزەوە پێشکەشکرد و کەوتنە ستایش و پێداهەڵگوتنی حەزرەتی بەهائوڵڵا و ئەو بەیتەی شاعیر (عورفی شیرازی)یان وەبیر هەموان دەهێنایەوە کە دەڵێت:

**چنان با نیك و بد خو کن که بعد از مردنت عرفی**

**مسلمانت به زمزم شوید و هندو بسوزاند**

# بەشی سێزدەیەم

# ئێمە و خوداوەند

ئایینی بەهایی ئایینێکی جیهانییە کە ئامانجی یەکگرتوویی هەموو ڕەگەز و هۆز و نەتەوەکانی سەر گۆی زەوییە. بەهاییەکان باوەڕیان وایە کە حەزرەتی بەهائوڵڵا نێردراوی نوێی خوایە و خوا ئەم ئامانجەی بۆ سەدەکانی داهاتووی مرۆڤ پێشبینی فەرمووە و هەر بۆیە بۆ گەیشتن بەم ئامانجە لە ڕێگای بانگەشە و بڵاوکردنەوەی ئامۆژگاری و پەروەردەکانی بەهاییەوە هەوڵ دەدەن.

یەکەمین وانە لە پەروەردەکانی حەزرەتی بەهائوڵڵا سەبارەت بە خوا و پەیوەندیی ئێمەیە لەگەڵ خوا. خوای تەنیا کە توانا و بەهێز و پارێزەر و بەدەستەڵاتە، خوڵقێنەری هەموو شتێکە. ئەو جیهانی سروشت و هەرچی تێیدایە و ئاسمانەکان و بوونی خوڵقاندووە و مرۆڤی لە دیمەن و وێنای خۆی خوڵقاندووە. حەزرەتی بەهائوڵڵا فێری کردووین کە ناتوانین حەقیقەتی خوا درك بکەین، چونکە خوڵقێنراو ناتوانێ خوڵقێنەری خۆی درك بکات یان کاتژمێر درك بە دروستکەری خۆی ناکات. ئێمەش کە خوڵقاوی خواین هەرچی سەبارەت بە خوا و ناسینی یان درکپێکردنی تایبەتمەندیی و سیفەتەکانی وێنا بکەین یان بیڵێین، بەرهەمی فکر و خەون و خەیاڵمانە.

خوا لەبەر خۆشەویستیی خۆی بۆ ئێمە، ئێمەی خوڵقاندووە، بۆیە دەفەرموێ:

**يَا ابْنَ الإِنْسانِ أَحْبَبْتُ خَلْقَكَ فَخَلَقْتُكَ، فَأَحْبِبْني كَيْ أَذْكُرَكَ، وَ في رُوحِ الْحَياةِ أُثَبِّتُكَ.**

واتای بەیانەکە ئەمەیە کە: ئەی کوڕی مرۆڤ تۆم خۆشدەویست، کەواتە تۆم خوڵقاند، کەوایە تۆش منت خۆش بوێت تا یادت بکەم و لە رووحی ژیاندا ڕاوەستاوت بکەم.

لەڕاستیدا تەنیا هۆکاری بوونی ئێمە لەم جیهانەدا، ئەو عەشقەیە کە خوا بۆ ئێمەی هەیە. ئێمە دەبێ بەردەوام ئەو عەشقەمان لە یاد بێت. ئەم عەشقە پارێزگاریمان لێدەکات، یارمەتیمان دەدات و رووحی ژیانمان پێدەبەخشێت. هەرکات گرفت و بەڵا ڕوومان تێبکات، دەبێ وەبیرمان بێتەوە کە خۆشەویستیی ئەو بەردەوام لەگەڵمانە و هەروەها لە کاتی شادی و ئاسوودەیشدا نابێ لەبیربکەین کە ئەو بۆ ساتێکیش جێمان ناهێڵێت. ئامۆژگاریەکانی خوا فێرمان دەکات کە هاوکات لەگەڵ خوڵقاندنمان، بەڵێن یان گرێبەستێك لە نێوان ئێمە و خوادا دەبەسترێت کە هەتا ئەبەد بەردەوام دەبێت. بەهاییەکان بەم بەڵێنە دەڵێن پەیمانی خوایی (میثاق). لەم پەیمانەدا ئەو خوایەی کە بەهۆی خۆشەویستی و عەشقەوە ئێمەی خوڵقاندووە، بەڵێنی داوە کە هیچ کات لە ژیاندا بە تەنیا جێمان نەهێڵێت و بەردەوام بمانخاتە بەر بارانی خۆشەویستیی خۆی.

لەمڕووەوە، خوا هەر ماوەی جارێك لە مێژوودا، بەهۆی بەخشندەیی و

گەورەیی خۆیەوە کەسانێك هەڵدەبژێرێت و لە ڕێگەی ئەوانەوە ئامۆژگاری و بڕیار و فەرمانەکانی خۆیمان فێردەکات کە دەبنە هۆی گەشە و ڕێنوێنی ئێمە و ئاسوودەیی و شادی ڕاستەقینە بۆمان. ئەم نەفسە هەڵبژێردراوانە کە ئاوێنەی تیشکی ڕووناکیی خوایین، بە (مظاهر ظهور) ناودێر دەکەین. ظهور واتە ئاشکرا بوون. (مظاهر ظهور) کەلامی خوا و ویستی ئەو بۆ مرۆڤ ئاشکرا دەکەن.

نموونەیەك لە جیهانی مادی دەتوانێ واتای (مظهر ظهور) ڕوون بکاتەوە. دەزانین کە خۆر سەرچاوەی گەرمی و ڕووناکییە و بە بێ ئەو ژیان لەسەر گۆی زەوی مەحاڵە. ئەگەر لە شوێنێك بین کە نەتوانین ڕاستەوخۆ هەتاو ببینین، ئاوێنەیەکی پاك دەتوانێ لە بەرانبەر خۆردا بوەستێت و تیشکی خۆرمان بەسەردا ببارێنێت. جا هەرچی ئاوێنەکە ڕوونتر بێت خۆر ئاشکراتر و درەوشاوەتر تێیدا دەردەکەوێت. (مظاهر ظهور) هەمان ئەو ئاوێنە ڕوونانەن کە پرشنگی خوا بە هەموو گەورەییەوە بەسەر ئێمەدا دەبارێننەوە. ئاشکرایە کە هەموو ئاوێنەکان هەر یەك تیشکمان پێ دەگەیەنن.

بەهۆی ئەوەی دەستڕاگەیشتن بە خوا بۆ ئێمە مەیسەر نییە _چونکە ئەو لەوپەڕی گەورەیی و بەرزیی خۆیدایە و خوڵقێنەری ئێمەیە و ئێمە خوڵقاوی ئەوین_ (مظاهر ظهور) کە وردەوردە بە درێژایی زەمەن دەردەکەون، ساڵانێك لە ناوماندا دەژین، ڕێنوێنیمان دەکەن و هێزێکی بەرین بۆ گەشەی مادی و مەعنەوی لەم جیهانەدا ئاشکرا دەکەن.

ئەوان کەلامی خوا و ویستی ئەو بۆ ئێمە ئاشکرا دەکەن و فێرمان دەکەن کە

چلۆن بەپێی ویستی ئەو ژیان بکەین و بە بەختەوەریی ڕاستەقینە بگەین. ژمارەیەك لەم مامۆستا ئاسمانیانە بریتین لە: حەزرەتی بودا، حەزرەتی زەردەشت، حەزرەتی مووسا، حەزرەتی مەسیح، حەزرەتی محەمەد و هەروەها حەزرەتی باب و حەزرەتی بەهائوڵڵا.

ئەو پەیمانە وەبیر بهێنینەوە کە خوا لەگەڵ ئێمەی بەست و بەڵێنی دا کە بەردەوام بەهۆی ئەو خۆشەویستییەی کە بۆ ئێمەی هەیە، هیچکات تەنیامان ناهێڵێت. خوا بەڵێنی خۆی بەجێ هێناوە و ناردنی (مظاهر ظهور) کە ناویان هێنرا، بەڵگەیەکە بۆ ئەم قسەیە. بێگومان ئەو لە داهاتووشدا بە بەڵێنەکەی خۆی پابەند دەبێت و کەسی دیکەش لە (مظاهر ظهور) بۆ جیهان دەنێرێت.

دەزانین کە هەر پەیمانێك دوو لایەنی هەیە، واتە لایەنەکەی دیکەی ئەم پەیمانە ئێمەین. خوا بەردەوام بە بەڵێنەکانی خۆی پابەندە، بەڵام ئایا ئێمەش بە بەڵێنەکەی خۆمان پابەند و وەفادارین؟ بەگشتی ئەرکی ئێمە لە بەرانبەر ئەم بەڵێنەدا چییە؟

هەڵبەت دیارە ئێمەش بەڵێنی خۆشەویستیی ئەومان داوە. بەڵێنمان داوە کە خۆشمانبوێت، بەردەوام یادی بکەین و فەرمانەکانی بەجێ بهێنین. لەڕاستیدا ئامانج لە ژیانی ئێمە ناسینی خوا و بەندەیی و عیبادەت کردنییەتی.

لە نوێژی بەهاییدا دەڵێین:

**أشهَدُ يا إلهي بأنّك خَلَقْتَني لِعِرفانِكَ و عِبادتِكَ أشهَدُ في هذا الحين بِعجزي و قُوَّتِكَ و ضَعفي و إقتِدارِكَ فقري و غَنائكَ لا إلهَ إلا أنتَ المُهيمنُ القيوم.**

واتای بەیانەکە ئەوەیە کە: ئەی خوای من شایەتی دەدەم بەوەی کە منت بۆ ناسین و بەندەیی خۆت خولّقاند. ئێستاش شایەدی دەدەم لەسەر لاوازی و بێتوانایی خۆم و بەهێزیی تۆ و کزیی و هەژاریی خۆم و دەستەڵات و بێ نیازی و دەوڵەمەندیی تۆ. خوایەك نییە جگە لە تۆ خوای بەتوانا و چارەنووسساز.

بەڵێن و پەیمانی خوا داوامان لێدەکات هەتا خوا لە ڕێگەی (مظاهر ظهور) بناسین، خۆشمانبوێت و پەیڕەوی بڕیار و ئامۆژگاریەکانی بکەین.

حەزرەتی بەهائوڵڵا نیشانەی ئاشکرابوونی ئەم سەردەمەیە و ئەو ئامۆژگاری و فەرمان و بڕیارانەی لە قەڵەمی ئەو حەزرەتەوە نازڵ بووە، لەم ڕۆژە پیرۆزەدا دەمانگەیەنێتە بەختەوەریی ڕاستەقینە. دەبێ بەردەوام سوپاسگوزاری بارەگای خوا بین کە لە وەها ڕۆژێکدا دەژین کە بەڵێنەکانی کتێبە پیرۆزە ئاسمانییەکان وەدیهاتووە. حەزرەتی بەهائوڵڵا دەفەرموێ:

**ئەمڕۆ ڕۆژی چاکەی گەورە و گەورەترین فەیزە. دەبێ گشت، بەوپەڕی یەکگرتوویی و یەکڕیزی، لە ژێر سێبەری عینایەتی خوادا بحەسێینەوە و بژین.**

# بەشی چواردەیەم

# ئێمە و مەزهەرە پیرۆزەکان

دەزانین کە جیهانی سروشت، ناتەواوە. بۆ هەرکام لە لایەنەکانی ژیان بڕوانین، هەست بە پێویستبوونی مامۆستا دەکەین. لە جیهانی سروشتدا، باخێکی میوە کە بە دەستی باخەوانێکی لێهاتوو پەروەردە کرابێت، لە سەد دارستان، بەری زیاترە. لە جیهانی مرۆڤیشدا ئەگەر مرۆڤ هەروا تەنیا بهێڵدرێتەوە، هیچکات بە پلەوپایە بەرزەکان ناگات.

پەروەردە، دەبێتە هۆی ئاوەدانی. پەروەردە، دەبێتە هۆی هۆشیاری. پەروەردە، دەبێتە هۆی شارستانییەت. پەروەردە، مرۆڤ لە مەلەکوتی خوا ئاگادار دەکاتەوە و دەیکاتە بوونەوەرێکی رووحانی.

پەروەردە دوو جۆرە: مادی و خوایی

پەروەردەی مادی پەیوەندیدارە بە شارستانییەت و پێشکەوتنی جیهان. پەیوەندیی بە حکوومەتەوە هەیە. پەیوەندیی بە سیستمەوە هەیە. پەیوەندیدارە بە کاروباری کۆمەڵایەتی و بازرگانی و هونەر و پیشەسازی و زانست و دۆزینەوە و داهێنانی زانستییەوە. بەڵام پەروەردەی خوایی لە لایەن وەرگرتنی کەماڵی خوایی و سیفەت و ڕەفتاری روحانییەوەیە.

جیهانی مرۆیی بۆ پێشکەوتن پێویستی بە مامۆستایە. مامۆستای مادی و مامۆستای رووحانی هەردوویان پێویستن. ئەگەر کەسێك بڵێت من لە لایەن فکرییەوە کامڵ بووم و پێویستم بە مامۆستا نییە، وەك ئەوەیە کە منداڵێك بڵێت من پێویستم بە فێربوون و پەروەردە نییە و هەر بەو پێیە رەفتار دەکەم و بە کەماڵ دەگەم کە عەقڵ و تێگەیشتنم پێم دەڵێت. جیهانی مرۆڤ بەردەوام و لە هەموو حاڵێکدا پێویستی بە مامۆستای خواییە. چونکە مرۆڤ هەرچی زیاتر گەشە بکات دیسان هەر پێویستی بە پەروەردەی خوایی هەیە. پێویستی بە بەخشندەیی مەلەکوتی هەیە. هەتا مرۆڤ ئەم پەروەردەیە وەرنەگرێت، کامڵ نابێت.

هیچ مرۆڤێکی ئاسایی ناتوانێت بگاتە ئەو پلەیەی کە پەروەردەی رووحیی خەڵکی دیکە بکات. تەنیا (مظاهر ظهور) دەتوانن رووح و دڵ و جیهانی ئەخلاق پەروەردە بکەن. بۆ وێنە حەزرەتی مەسیح مامۆستایەکی رووحانی بوو. مامۆستایەکی ئاسمانی بوو. باخەوانێکی خوایی بوو کە دارستانی سروشتی مرۆڤی کردە گوڵستان. دارە بێبەرەکانی کردە داری بەردار. کێڵگەی گیانی ئەو کەسانەی کردە باخێکی پڕ لە گوڵ و رێحان، کە بەهۆی دۆخی سروشتییەوە تەنیا دڕکوداڵی تێدا ڕوابوو. (مظاهر ظهور) رووحێکی نوێ دەکەن بە بەر جەستەکاندا و عەقڵێکی نوێ بە تاکەکان دەدەن. گەشە و پێشڤەچوونی گەورە دەبەخشن و جیهان ڕووناك دەکەنەوە. بەڵام ماوەیەك تێناپەڕێت کە دیسان تاریك دەبنەوە. تیشك و رووناکایی ئاسمانی نامێنێت. هەستە سروشتییەکان دیسان زاڵ دەبنەوە. وەك ئەوەی کە جووتیارێك زەویەکەی دەکێڵێت و تۆوی پێوە دەکات. تۆوەکە دێتە بەر. بەڵام ئەگەر

زەویەکە هەروا بە بەیاری دابنرێت، دیسان دەبێتەوە دڕکودالّ. هەرزە گیای لێ شین دەبێت. جیهانیش بە هێز و توانای (مظاهر ظهور) وەك مەزرایەکی پڕ پیتوبەرەکەت بوو، باخ و بێستان بوو. تاریکیی نەزانی نەبوو. تیشکی رووناکیی خوا ئاشکرا بوو. بەلاّم دوای ماوەیەك جیهان بە گشتی تاریك داهات. رووناکایی خوایی بە هیچ چەشنێك نەما. بەخششی خوایی نەما. ئاگری دوژمنایەتی و نەفرەت و ناکۆکیەکان بڵێسەی سەند. دیسانیش خواوەند، یەکێکی دیکە لە نیشانەکانی ئاشکرابوونی (مظاهر ظهور) ئاشکرا کرد. جیهانی عەقڵ و ئەندێشە و دڵ و هەستەکان دیسان بە نووری خوا ڕووناك بوونەوە.

وەك ئەوەیە کە ڕۆژ بوو و خۆر دەدرەوشایەوە. تیشك و گەرمای خۆر فراوانیی بە هەموان دەبەخشی. کاتێك خۆر ئاوابوو، تاریکایی زاڵ بوو. ڕەشایی بەسەر دڵ و دەروون و ئەندێشەدا زاڵ بوو. دیسان خۆر هەڵات و دووبارە رووناکایی خۆر بە دڵان گەیشتەوە.

ئەگەرچی خۆری ئەمڕۆ هەمان خۆری دوێنێیە، بەلاّم کات گۆڕاوە. تەنانەت ئاسۆی هەلاّتنی خۆریش هەندێك جیاوازە لە دوێنێ، بەلاّم خۆر هەر هەمان خۆرە. (مظاهر ظهور) وەك خۆر بەسەر ئەم جیهانەدا دەدرەوشێنەوە. حەقیقەتی بوونیان هەر یەکە، بەلاّم زەمان و کاتی دەرکەوتن و ئاوا بوونیان لەم جیهانەدا جیاوازە. هەروەها شوێنی دەرکەوتنیشیان جیاوازە لە یەکتر، بەم حاڵەشەوە هەتاو لە دانەیەك زیاتر نییە.

حەزرەتی مووسا لە میسر ئاشکرا بوو، حەزرەتی زەردەشت لە ئێران

سەریهەڵدا، حەزرەتی مەسیح لە ئورشەلیم دەرکەوت و حەزرەتی بوودا لە هیندستان. حەزرەتی محەمەد لە عەرەبستانەوە تیشکی بەسەر جیهاندا باری و حەزرەتی باب و حەزرەتی بەهائوڵڵا لە ئێران ئاشکرا بوون. تیشکی هەموان هەر یەك بوو ئەگەرچی لە ئاسۆی جۆراوجۆر و لە کاتی جیاوازدا درەوشانەوە، بەڵام ئامانجی هەموان، پەروەردەی رووحانیی مرۆڤ بوو.

## بەشی پانزەیەم

# حەقیقەتی ئایینەکان هەر یەکێکە

ئێمە دەبێ عاشقی پرشنگ بین جا لە هەر چرایەکەوە بدرەوشێت. دەبێ عاشقی گوڵ بین لە هەر باخێك بڕوێت. دەبێ خوازیاری خۆری حەقیقەت بین لە هەر ئاسۆیەکەوە هەڵبێت. ئەگەر ڕوانینمان تەنیا بۆ یەك ئاسۆ بێت، لە ڕووناکی خافڵ دەبین. ئەگەر دڵ بە ڕواڵەتی چرا بدەین بێبەش دەبین لەو تیشکەی کە لە چرایەکی دیکەوە دەدرەوشێت. هەروەها دڵبەستەیی بە ڕواڵەتی هەر ئایین و دابونەریتی عیبادەتی ڕواڵەتیی و حوکمەکانی ئەو دینە نابێ لەمپەری ڕێگەی درکپێکردنی حەقیقەتی هەموو ئایینەکان بێت.

حەقیقەتی هەموو ئایینەکان هەر یەکێکە و ئەویش دابونەریتی خواییە. بەدەستهێنانی تایبەتمەندییە مرۆییەکانە. پەروەردەی هەموو مرۆڤە. ڕووناکایی ئاسمانییە. کرداری پەسند و بەجێیە. ڕەفتاری بەخشندەییە. خۆشەویستییە. خزمەت بە هەموو مرۆڤێکە، یەکێتی و یەکڕیزیی جیهانی مرۆڤە.

بەڵام بەداخەوە دەمارگرژی و لاساییکردنەوە و خورافات وەك هەورێکی ڕەش، ئەم تیشك و ڕووناکاییانەی داپۆشیوە و جیهانی تاریك کردووە. ئەگەر ئێمە خوازیاری حەقیقەتین دەبێ دەمارگرژی وەلا نێین و لە خورافات دوور بکەوینەوە. دەبێ ئاگادار بین کە واتای غیرەت و جوامێری بە تەواوی لەگەڵ

دەمارگرژی جیاوازە و جیاوازیی گشتی هەیە لە نێوان خورافات و دەمارگرژی و لاساییکردنەوە لە لایەك و حەقیقەت لە لایەکی دیکەوە. ئەگەر لەمە تێبگەین، بە ڕوونی دەبینین کە حەقیقەتی نووری خوا لە هەموو نیشانەکانی ئاشکرابووندا وەك یەکە. لە حەزرەتی مووسا، حەزرەتی زەردەشت، حەزرەتی بودا، حەزرەتی مەسیح، حەزرەتی محەمەد، حەزرەتی باب و حەزرەتی بەهائوڵڵا، حەقیقەتی نووری خوا وەك سەرچاوەی زانستی پیرۆز و ئاسمانی بوونی هەبووە.

ئەگەر ئێمە عەوداڵی حەقیقەت بین، دەبێ پەرداخی دەروونمان لە خۆپەرستی و خۆویستی و هزر و باوەڕی کۆنی نەشیاو بەتاڵ بکەینەوە هەتا لە ئاوی حەیات پڕ بێت. دەبێ ئەندێشەمان بخەینە بەر تیشکی حەقیقەت و خۆمان بۆ سوودمەند بوون لە بارانی بەخشش و کەرەمی خوا شیاو بکەین هەتا تۆوی حەقیقەت لە دەروونماندا بڕوێت و مەزرای دڵمان ببێتە گوڵستان و گوڵزاری خوایی.

بۆ گەیشتن بە حەقیقەت، یەکێتی و یەکگرتن پێویستە. لەبەر ئەوەی حەقیقەت یەکە. گەورەترین لەمپەر بۆ گەیشتن بە یەکڕیزی و یەکگرتوویی ئەوەیە کە بیرکردنەوەی خۆمان بە ڕاست و بیری خەڵك بە ناڕاست بزانین.

حەزرەتی بەهائوڵڵا دەفەرموێ:

**ئەی خەڵکی جیهان، ساباتی یەکبوون هەڵدرا. بە چاوی بێگانەوە لە یەکتر مەڕوانن. هەموو بەری دارێکن و گەڵای لق و پۆپێکن.**

دەتوانین مرۆڤایەتی بە گوڵستانێکی بەرین بشوبهێنین کە زۆر گوڵی بە شکڵ و ڕەنگ و بۆنی جۆراوجۆری تێدا ڕوواوە. جوانی و سەرنجڕاکێشی گوڵستانەکە

به جۆراوجۆری و فره چەشنیی گوڵەکانییەتی. ئێمە نابێ ئیزن بدەین جیاوازییەکان لە بوارە جۆراوجۆرەکانی وەك (ڕواڵەت، ئەخلاق، باوەڕەکانی ڕابردوو و ئەندێشە و بۆچوونەکان) ببنە هۆی ململانێ و کێشە و ناکۆکی. ئێمە تاکەکانی مرۆڤ وەك گوڵێکی جوان دەبینین کە لە گوڵستانی مرۆڤایەتیدا ڕواون و لەمڕووەوە هەموو هەست بە شادی و خۆشی دەکەین کە سەر بەم گوڵستانەین. ئێمە هەموو هەوڵمان ئەوەیە کە ئەندێشە و کردارمان لەگەڵ باوەڕمان بە یەکێتیی جیهانی مرۆڤایەتی بخەینە یەك ئاراستەوە. ئەگەر بیری شەڕ بە بیری بەهێزتری ئاشتی بگۆڕینەوە و بیری خۆشەویستی لە جیاتی بیری نەفرەت بهێنین، دەتوانین هیوادار بین کە بەسەر ئەندێشەی خۆپەرستانەدا زاڵ بین و خەڵکمان هەر بەو شێوەیە خۆش بوێت کە هەن و هەر بەو شێوەیە قبووڵیان بکەین کە بیر دەکەنەوە و هەن. ڕێگەی یەکێتی و یەکڕیزی لەم ڕێگایەوە دەڕوات.

بۆ گەیشتن بەم ئامانجە هەر کامە لە ئێمە دەبێ خۆمان وەدوای حەقیقەت بکەوین و دەروێش و پەیڕەوی ئەو کەسانە نەبین کە پێڕەوی هەوا و هەوەسی خۆیانن و بۆ خواستەکانی خۆیان و پاراستنی پلەوپایەکەیان، حەقیقەتەکان بە پێچەوانەوە نیشان دەدەن و بە ناوی دینەوە پێشگیریمان لێدەکەن بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر ئایینی نوێ. دەبێ ئاو لە سەرچاوە هەڵێنجین و نوور لە سەرچاوە واتە لە خۆر وەرگرین.

**مرۆڤ وەك کانە بەردێك ببینە کە تاشەبەردی گەورەی تێدایە. بە پەروەردە کردن، گەوهەری دەردەکەوێت و جیهانی مرۆڤایەتی لێی سوودمەند دەبێت.**

# بەشی شانزەیەم

# حەزرەتی عەبدولبەها

تەوەری سەرەکیی ژیانی بەهاییەکان ئەو پەیمان و بەڵێنەیە کە لەگەڵ حەزرەتی بەهائوڵڵا وەك نیشانەی ئاشکرا بوونی خوایی لەم سەردەمەدا بەستوویانە. لە ئاشکرابوونەکانی پێشوودا هەرکات سەردەمی ژیانی پێغەمبەر لەم جیهانەدا کۆتایی دەهات، هیچ وەسیەت و نووسراوێکی ئاشکرا لە پێغەمبەر بەجێ نەدەما هەتا لە بارودۆخی باوەڕداران ڕوونبکاتەوە. واتە کەسێك کە بتوانێ لە لایەن ئەوەوە ئایەت و ئامۆژگاریەکان شیبکاتەوە و ناکۆکی و بۆچوون و باوەڕە جۆراوجۆر یەکبخات. ئەگەر پێغەمبەریش بە زمان کەسێکی بۆ ئەم پلەوپایەیە دەناساند، چونکە بەڵگەیەکی نووسراو لەبەردەستدا نەبوو، خەڵکێکی زۆری بەرژەوەندخواز و خوازیاری سەرۆکایەتی، کارەکانیان بە دەستەوە دەگرت و فەرمانڕەواییان بەسەر ئیماندارانی ئەو ئایینەوە دەکرد. هەروەها باوەڕی جۆراوجۆر و هەڵێنجانی فرە چەشن لە ئایەت و کتێبە پیرۆزەکان دەبووە هۆی سەرهەڵدانی گرووپ و مەزهەبی زۆر لە هەموو ئایینەکاندا. بەڵام لەگەڵ گۆڕانی دۆخی جیهانی مرۆڤ و پێشکەوتنی مرۆڤ، لە ئایینی بەهاییدا ئەمە وا نابێت. حەزرەتی بەهائوڵڵا ئاسانکاری و ڕێنوێنیەك کە لە مێژووی هەموو ئایینەکاندا بێوێنەیە، ئەرك و فەرمانی خۆی لە پەرشوبڵاوی و لەت لەت بوونێکی وەها پاراست.

حەزرەتی بەهائوڵڵا پێش کۆچی دوایی کردنی، لە وەسیەتنامەکەیدا بە ئاشکرا فەرمووی دوای حەزرەت، بەهاییەکانی هەموو جیهان دەبێ شوێنکەوتووی کوڕە گەورەکەی واتە حەزرەتی عەبدولبەها بن. لەو وەسیەتنامەیەدا کە بە (کتێبی پەیمانی من)(کتاب عهدی) ناسراوە، کوڕە گەورەکەی خۆی وەك جێگری خۆی، شیکەرەوەی ئایەتەکان و ناوەندی سەرنجی ئیمانداران دەستنیشان کرد.

حەزرەتی عەبدولبەها لە شاری تاران و لەو شەوەدا لەدایك بوو کە حەزرەتی باب مەسەلەی فەرمانی خودای بە مەلا حسێن فەرمووبوو. حەزرەتی عەبدولبەها هەر لە منداڵییەوە لە ئازار و ڕەنجەکانی باوکیدا هاوبەش بوو. لە سەرەتای مێردمنداڵییەوە لە پلەی بەرزی حەزرەتی بەهائوڵڵا تێگەیشت و لە هەموو سەردەمی ژیانی ئەو حەزرەتە کە لە زیندان و تاراوگەدا تێپەڕێ، پاڵپشت و هاوڕێی بوو. حەزرەتی عەبدولبەها ٧٧ ساڵ لەم جیهانەدا ژیا. ئەگەرچی ژیانی ئەو حەزرەتە پڕبوو لە ئازار و ڕەنج و بەڵا، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەو کەسانەی سەردانیان دەکرد و دەهاتنە خزمەتی، بە شادی دەجوڵایەوە و شادمانی و بەختەوەریی پێ دەبەخشین. لە سەردەمی نیشتەجێبوون لە بەغدا، ئەو حەزرەتە سەرەڕای تەمەنی کەم، لە لایەن زانایانی ئیسلامی ئەو شارەوە زۆر ڕێزی دەگیرا. زانایانی موسڵمان و ئەو زانایانەی کە شانازیی دیداری حەزرەتیان پێدەبڕا، هۆگر و شەیدای ئەخلاق، زیرەکی، تێگەیشتوویی و شارەزایی ئەو حەزرەتە لە زانستی ئەو سەردەمە دەبوون. ئەدەبیات و قسەڕەوانیی ئەو حەزرەتە لە وتار و نووسیندا هەر لە هەمان سەردەمی گەنجێتیەوە، هەموو زانایانی تووشی سەرسووڕمان کرد.

کاتێك حەزرەتی بەهائوڵڵا لەم جیهانەدا کۆچیکرد، بەرپرسیارێتیی کۆمەڵگەی بەهایی کەوتە سەرشانی حەزرەتی عەبدولبەها. ئەو خەسارە قورسەی بە لەدەستچوونی (مظاهر ظهور) لە ئیمانداران کەوت، تەنیا بە ناردنی نامە و نووسراو لە لایەن حەزرەتی عەبدولبەها قەرەبوو دەکرایەوە کە پێیان دەوترێت و لەوح و نووسراوەکانی عەبدولبەها. لە ڕاستیدا ئەم لەوحانە، واتە خۆراکی رووحی ئەو ئیماندارە عاشقانە، بەهاییەکانی ڕێنوێنی کرد تا لە قووڵایی ئەو دڵەڕاوکێ و شۆڕش و هەڵچوونانەی کە هەڕەشەی بەردەوام بوون بۆ سەر کۆمەڵگەی تازە دامەزراو و بیپارێزێت و لەو گێژاوانە بە سەلامەتی تێپەڕیان بکات.

لە سەردەمی حەزرەتی عەبدولبەهادا هەزاران لەوح بۆ کەسایەتی و گرووپەکان لە شوێنە جۆراوجۆرەکانی جیهان نازڵ کرا و نێردرا و ئامۆژگارییەکانی حەزرەتی بەهائوڵڵا ڕوونتر و مەشرووعتر باسکرا. هەر چەشنە گومان و ڕاڕاییەك ڕەویەوە و بناغەی کۆمەڵگە لەسەر کۆڵەگەیەکی پتەو بنیات نرا.

حەزرەتی عەبدولبەها لە سەردەمی ژیانی خۆیدا لە عەکا و حەیفا، سەردانی سوریا و لوبنان و میسری کرد و لەم سەفەرانەدا پەیوەندیی نزیکی هەبوو لەگەڵ زانایانی ئایین و فەلسەفە و زۆربەی زانایانی موسڵمان و دەسەڵاتدارانی ئێران، پاشاکان، نوێنەرانی پەرلەمانی تورکیا و سەرۆك و بەڕێوەبەرانی دامەزراوە گەورە ئایینی و نائایینییەکان، سەردانیان دەکرد و دەچوونە خزمەتی.

حەزرەتی عەبدولبەها هەروەها بۆ ماوەی نزیك بە ٢ ساڵ سەردانی ڕۆژئاوای کرد و سەرکەوتنی گەورەی بۆ بانگەشە و پەرەپێدانی ئایینی بەهایی و پتەوکردنی لە وڵاتانی ئەورووپا و ئەمریکا بەدەستهێنا. لەم سەفەرانەدا

بوو کە حەزرەتی عەبدولبەها بنەماکانی ئەم ئایینە نوێیە ئاسمانییەی کە ئامۆژگاریەکانی باوکی بەڕێزی خۆی بوو، بە هێز و گەورەییەکی سەرسووڕهێنەرەوە لە ناو چین و توێژە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگەدا بڵاوکردەوە و هەمووانی بۆ قبووڵکردنیان و چوونە ناو قۆناغێکی نوێ لە پێشکەوتنی مرۆڤ بانگهێشت کرد کە هەنگاونانە بۆ چوونەناو ساباتی یەکڕیزی و یەکێتی.

لەو کۆمەڵ و کولتوورەی کە حەزرەتی عەبدولبەها دەیئافراند، هێزە رووحانییەکان لە ژیانی ڕۆژانەی خەڵکدا بەرجەستە دەبوون. ئەو هێزانەی کە دەبوونە هۆی گۆڕان و شۆڕشی مەعنەوی و ئەخلاقی. سەرچاوەی ئەم ئاڵوگۆڕە مەعنەویە، ئەو بەڵێنە بوو کە حەزرەتی بەهائوڵڵا لە شوێنکەوتوانی خۆی وەرگرتبوو و دوای خۆی، ڕێبەرایەتیی ئایینەکەی بە حەزرەتی عەبدولبەها سپاردبوو.

حەزرەتی عەبدولبەها بەرزترین و باڵاترین خوڵقاوی وشەی حەزرەتی بەهائوڵڵا بوو. ئەگەر گریمان خوا پەیامێکی گەورەی بۆ مرۆڤ هەبێت و گوێی مرۆڤ توانای بیستنی پەیامێکی وەهای نەبێت، خوای بێ هاوتا، حەزرەتی عەبدولبەهای بە جیهان بەخشی تا بە نوێنەرایەتی لە هەموو مرۆڤێك، پەیامی خوا بە تەواوی وەرگرێت. لە ڕاستیدا ئەو بوو کە دەنگی خوای بە تەواوی بیست. ئەو بوو کە ئیلهامە غەیبییەکانی بە رووح دەگەیشت. ئەو بوو کە لە واتای ئەم پەیامە نوێیە تێگەیشت و بوو بە زامن هەتا مرۆڤ ئەم پەیامە بە گیان و دڵ ببیستێت و وەڵامی بداتەوە. ئەو بوو کە پەیامی حەزرەتی بەهائوڵڵای بیست و لەگەڵ خودا پەیمانی بەست کە مرۆڤ بگەیەنێتە مەنزڵگای یەکڕیزی و یەکێتی.

بە قبووڵکردنی حەزرەتی عەبدولبەها وەك جێگری حەزرەتی بەهائوڵڵا، بەهاییەکان لە هەوڵەکانی خۆیاندا بۆ خاوەنداریێتیی ژیانی بەهایی و دامەزراندنی شارستانییەتی خوایی، یەکگرتوو مانەوە.

ئێمە لەبیرمانە کە وەك بەشێك لە بەڵێنمان بە حەزرەتی بەهائوڵڵا، دەبێ یەکتریمان خۆشبوێت و نیشانەی خۆشویستن لە بوونی حەزرەتی عەبدولبەهادا دەبینینەوە.

دەزانین کە دەبێ عادڵ بین، بەخشندە بین، چاو لە هەڵەکانی یەکتر بپۆشین و شانازی بە خزمەتکردنی مرۆڤەوە بکەین. دەتوانین لە حەزرەتی عەبدولبەهاوە دادگەری، گەورەیی، بەخشندەیی و بەندەیی فێربین.

بە ڕەچاوکردنی ئامۆژگاری و پەندەکانی حەزرەتی عەبدولبەها زیاد لە هەموو شتێك ئاگاداری ئەو پەیمانەین کە لەگەڵ حەزرەتی بەهائوڵڵا بەستوومانە و بەشێك لەو پەیمانەش ئەوەیە کە هیچ کات نەهێڵین یەکێتیی کۆمەڵگە لەبەریەك هەڵبوەشێتەوە. هەموو هەوڵی بەهاییەکان بۆ پێکهێنانی کۆمەڵگەیەکی جیهانیی یەکگرتووە و لەم ڕێگەیەدا هەتا گەیشتن بە یەکێتیی جیهانیی مرۆڤی سەر زەوی، بە گیان و دڵ تێبکۆشین.

حەزرەتی عەبدولبەها لە مانگی نۆڤەمبری ١٩٢١ بەرەو دیاری هەرمان کۆچی کرد. ڕێوڕەسمی بەخاکسپاردنی پەیکەری پیرۆزی ئەو حەزرەتە بە چەشنێك بوو کە هیچکەس لە وێنەی ئەم ڕێوڕەسمەی لە وڵاتی فەلەستین تا ئەوکات نەبینیبوو. زیاتر لە ١٠ هەزار کەس لە خەڵکی جۆراوجۆر لەو ڕێوڕەسمەدا بەشدارییان کرد. هەر لە زانایانی ئیسلام و ئایینەکانی دیکەوە تا دەسەڵاتدارانی میری، باڵیۆزی دەوڵەتانی جۆراوجۆر، گەورەپیاوانی

فەلەستین، خەڵکی موسڵمان، جوولەکە، مەسیحی و ئایینەکانی دیکە چ میسری، تورك و عەرەب و یان لە شوێنەکانی دیکەوە لە ژن و پیاو، پیر و لاو هەمووان چاو بە گریان و دڵ سووتاو لەو ڕۆژەدا بەشدارییان کرد. وتارە خوێندراوەکانی نوێنەرانی ئیسلام، مەسیحی و هتد، لە باسکردنی تایبەتمەندییەکانی ئەو حەزرەتەدا و گەورەیی حەزرەت و خەم و پەژارەی خەڵکی ناوچەکان لە کۆچی دوایی حەزرەت، هەموو یەك لە دوای یەك لەوپەڕی ڕێزدا خوێندرانەوە.

نوێنەری ئیسلام، هەستی هاوبیرانی خۆی بەم چەشنە دەربڕی:

ئەی خەڵکی عەرەب و عەجەم بۆ کێ دەگرین و فرمێسك دەڕێژن؟ بۆ کەسێك کە لە ژیانی دوێنێی خۆیدا گەورە بوو و لە مردنی ئەمڕۆیدا گەورەترە؟ فرمێسك بۆ کەسێك مەڕێژن کە بەرەو دیاری هەرمان چووە، بەڵکوو بۆ لە دەستچوونی پاکی و عەقڵ و چاکە شیوەن بکەن. بۆ خۆتان بگرین کە ئێوەن لە دەستتان چووە و ئێوەن لەدەست چوون. ڕێبوارێك بوو کە لەم جیهانە کاتی و فەوتاوەوە بەرەو جیهانی هەرمان هەنگاوی نا. ساتێك بۆ کەسێك بگرین کە نزیك بە ٨٠ ساڵ بۆ ئێوە گریا. سەیری ڕاست و چەپی خۆتان بکەن. سەیری ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بکەن. ببینن چ گەورەیی و جەلالێك ون بووە. چ کۆڵەگەیەکی گەورەی ئاشتی ڕووخاوە. چ لێوێکی قسەزان بێدەنگ بووە و داخەکەم، دڵێك نییە کە لە خەمی ئەم بەڵایەدا بە ئازار نەبێت و چاوێك نییە کە دەریای فرمێسك نەبێت. هاوارم بۆ هەژاران چاکەیان لێبڕا، هاوار بۆ هەتیوان کە باوکی بەڕێزیان لەدەستچوو ...)

حەزرەتی عەبدولبەها لە وەسیەتنامەکەی خۆیدا کە بە (الواح وصایا)

ناسراوە، (شەوقی ئەفەندی) نەوەی گەورەی خۆی وەك (ولی امر الله) دیاریکرد. حەزرەتی شەوقی ئەفەندی کە ڕوونکەرەوەی کەلامی خوا بوو، بۆ ماوەی سی و شەش ساڵ ئەرکە پێسپێردراوەکانی باپیرەی خۆی درێژە پێدا. ئایەتەکانی (مظهر ظهور)ی شیدەکردەوە و ڕوونیدەکردنەوە و فەرمانی نوێی زیاتر لە ڕابردوو لە هەموو شوێنی جیهان جێگیر کرد.ئەویش لە ڕۆژی ٤ی نۆڤەمبری١٩٥٧ لەم جیهانەدا کۆچیکرد.

پێنج ساڵ و نیو دوای کۆچی دوایی شەوقی رەبانی، بەهاییەکانی جیهان (خانەی دادی گەورەی خوایی) یان هەر بەو شێوەیە کە حەزرەتی بەهائوڵڵا مژدەی دابوو و حەزرەتی عەبدولبەها و حەزرەتی ولی امر الله وتبوویان، هەڵبژارد. (خانەی دادی گەورەی خوایی) بەرزترین دامەزراوەی بەهاییە کە ناوەندی سەرنج و پێڕەویی هەموو بەهاییەکانی جیهانە.

## بەشی حەڤدەیەم

# حوکمەکان یان کلیلەکانی رەحمەت

یەکێك لە گرینگترین بەشەکانی هەر ئایینێك ئەو یاسا و حوکمانەیە کە پێغەمبەر (مظهر ظهور) بۆ رێنوێنی کردنی مرۆڤەکان دەیهێنێت. ئەم حوکمانە کە کلیلی خۆشبەختی و بەختەوەریی مرۆڤە، دوو جۆرن: هەندێکیان هەرمان و بەردەوامن و هەندێکیان لەگەڵ پێشکەوتن و گەشەی مرۆڤ، دەگۆڕێن، چونکە بەپێی زەمەن و سەردەمن.

لە ئایینی بەهاییدا فێر دەبین کە حوکمەکان بریتی نین لە کۆمەڵێك دەبێ و نابێ. حەزرەتی بەهائوڵڵا دەفەرموێ:

**انّ أوامِري سُرُجُ عِنايَتي بَينَ عِبادي و مَفاتيحُ رَحمَتي لِبَرِيَّتي**

حوکم و فەرمانەکانی من چرای بەخشندەیی و کەرەمی منە لە ناو بەندەکان و کلیلی رەحمەتی منە بۆ شوێنکەوتووانم.

لە ڕاستیدا بەهاییەکان بە ڕوانگەیەکی نوێوە بۆ ئەحکامی خوا دەڕوانن. ئەگەر سەردەمێك، مرۆڤ لە ترسی سزادان یان بە هیوای بەهەشت، بەو پێیە دەجووڵاوە کە خوا دەیفەرموو، لەم ئاشکرا بوونەدا، تەنیا بەهۆی خۆشویستنی خواوەندەوە، حوکمەکان پەیڕەو دەکرێن. چونکە حەزرەتی

بەهائوڵلا فەرموویەتی:

**أنْ إعمَلوا حُدودي حُبّاً لِجمالي**

(لەبەر ئەوەی منتان خۆش دەوێت یاساکانم پەیڕەو بکەن.)

لەبیرمانە ئەو پەیمانەی کە خوا لەکاتی خوڵقاندنماندا لەگەڵمانی بەست کە بەهۆی خۆشەویستیی بۆ ئێمە، ئێمەی مرۆڤی خوڵقاند و بەڵێنی دا کە هەرگیز بە تەنیامان نەهێڵێت. هەنووکە کاتی وەفای ئێمەیە بۆ پەیمانەکەمان کە بەهۆی خۆشەویستیی خواوە، فەرمانەکان و حوکمەکانی بەڕێوە ببەین.

هێنانەوەی چەند نموونە لە حوکمەکان، واتای ئەو چرای رووناکی بەخشە و کلیلەکانی بەخشندەیی باشتر بەیان دەکات:

جەستەمان پێویستی بە خواردنی رۆژانەیە. لانیکەم ڕۆژانە دوو یان سێ ژەم خواردنمان پێویستە. ئەگەر خواردن لە جەستەمان قەدەغە بکەین، جەستە نەخۆش دەکەوێت و پاشان لەوانەیە بە مەرگ کۆتایی پێبێت. کەواتە، خواردنی ڕۆژانە یاسایەکی ژیانی جەستەییە کە دەبێ پەیڕەو بکرێت.

رووحی ئێمەش پێویستی بە خواردنی ڕۆژانە هەیە. خواردنێك کە بەردەوام وزە و توانای پێ ببەخشێت. دوعا و پاڕانەوە لە خوا، خۆراکی پێویستی پێشکەوتنی رووحانی ئێمەیە. یەکێك لە حوکمەکانی حەزرەتی بەهائوڵلا ئەمەیە کە دەبێ ڕۆژانە دوعا و موناجات و پاڕانەوەمان هەبێت. ئەمە بەشێکە لەو پەیمانەی کە خودا لەگەڵ ئێمە بەستوویەتی. خوێندنەوەی دوعای ڕۆژانە، وەبیرمان دەهێنێتەوە کە بە تەنیا نین. کە ئەو هەمیشە لەگەڵمانە و هێزە روحانییەکانی ئەو پشتیوانمانن.

گەلێك موناجاتی جوان بە قەڵەمی حەزرەتی باب، حەزرەتی بەهائوڵڵا و حەزرەتی عەبدولبەها و حەزرەتی ولی امر الله نازڵ بووە کە دەتوانین بە تەنیا یان بە کۆڕ و کۆمەڵ بیخوێنین.

هەندێك لە دوعاکان و تایبەت و واجبن. یەکێك لەم دوعایانەی کە واجبە و کاتی خوێندنەکەی دەکەوێتە نێوان نیوەڕۆ هەتا ئێوارە، نوێژی بچووکە. ئەم نوێژە بە عەرەبیە:

**أشهَدُ یا إلهي بأنَّكَ خَلَقتَني لِعِرفانِكَ و عِبادَتِكَ أشهَدُ في هذا الحین بِعجزي و قُوَّتِكَ و ضَعفي و إقتِدارِكَ و فقري و غَنائكَ لا إلهَ إلّا أنتَ المُهیمنُ القیوم**

واتای بەیانەکە ئەوەیە کە: ئەی خوای من شایەتی دەدەم بەوەی کە منت بۆ ناسین و بەندەیی خۆت خوڵقاند. ئێستاش شایەدی دەدەم لەسەر لاوازی و بێتوانایی خۆم و بەهێزیی تۆ و کزیی و هەژاریی خۆم و دەستەڵات و بێ نیازی و دەوڵەمەندیی تۆ. خوایەك نییە جگە لە تۆ خوای بەتوانا و چارەنووسساز.

لە حوکمێکی تردا حەزرەتی بەهائوڵڵا، غەیبەتکردنو درۆهەڵبەستنی قەدەغە کردووە. بیرکردنەوە لەمەڕ هەر حوکمێك و ئاسەوارەکانی لە خۆمان و کۆمەڵدا، بینابیەکی تازەمان پێدەبەخشێت. بۆ نموونە غەیبەتکردن یەکێك لە گەورەترین دوژمنانی یەکڕیزی و یەکگرتووییە. ئایینی خوا بۆ یەکگرتن هاتووە و غەیبەتکردن خۆرەیەتی. غەیبەت ژەهرێکە بۆ ژیانی رووحانیی مرۆڤ.

سەیر ئەوەیە کە ئەمڕۆکە پاشملە قسەکردن، بووەتە نەریت و تەنانەت کولتوور. گوایە هەموو شتێکی باش فێربوون، ئەویش لەبیرکردنی

کەموکووڕییەکانی خۆیان و باسکردنی عەیبەکانی خەڵکە. ئەم کارە وەك ئەوە وایە کە ئێمە قوتوویەك ژەهرمان لەسەر سفرەی بەیانی و نیوەڕۆ و شەو داناوە و لە جیاتی شەکر بۆ نانی بەیانی و لە جیاتی زەڵاتە و خوێ بەکاری دەهێنین.

حەزرەتی بەهائوڵڵا دەفەرمووێ:

**خراپ مەبیستە و خراپ مەبینە و خۆت زەلیل مەکە و دەنگ هەڵمەبڕە، واتە خراپە مەڵێ تا نەیبیستی و عەیبی خەڵك گەورە مەزانە تا عەیبەکانت گەورە نەکەنەوە و ڕەزیلی بۆ کەس قبووڵ مەکە هەتا ڕەزیلی و سووکی سیمات دانەپۆشێت.**

هەروەها حەزرەتی عەبدولبەها داوامان لێدەکات کە ڕێك بەپێچەوانەی عادەتی خراپی غەیبەتکردن و باسی عەیبە، ڕەفتار بکەین. ئەگەر ١٠ سیفەتی باشمان لە کەسێك بینی و عەیبێکیشمان بینی، دەبێ سەرنج بدەینە ئەو ١٠ سیفەتە باشە و ئەگەر ١٠ سیفەتی خراپمان لە کەسێکدا بینی و سیفەتێکی باش، دەبێ تەنیا بڕوانینە ئەو سیفەتە باشە.

یەکێکی دیکە لە حوکمەکانی حەزرەتی بەهائوڵڵا سەبارەت بە گەورەیی و شەرافەتی مرۆڤە. دەزانین کە مەبەستی سەرەکی دەرکەوتنی حەزرەتی بەهائوڵڵا ئەوەیە کە خەڵکێکی نوێ بێتە بوون کە تایبەتمەندییە بەرزەکانی خوای تێدا دەرکەوێت. شکۆ و گەورەیی وەها تایبەتمەندییەك لە دەرەوەی ڕاددەی تێگەیشتن و درککردنی ئێستای ئێمەیە.

دارێکی گەورە و بە بەر لەبەرچاوبگرن، ئێمە ئەمڕۆ ئەو دارە دەبینین، بەڵام

هەر ئەم دارە کاتێك لە تۆوێك و بچووك و بە ڕواڵەت هیچ و شاراوە بووە. دەستی توانای باخەوان لە زەویەکی گونجاودا چاندوویەتی و پەروەردەی کردووە هەتا وردەوردە وەها دارێك دەرکەوتووە. لە دەروونی مرۆڤیشدا توانایی و لێهاتوویی هەیە کە تەنیا بە دەستی باخەوانی ڕاستەقینە هێدی هێدی پەروەردە دەبێت و دەردەکەوێت.

حەزرەتی بەهائوڵڵا دەفەرموێ:

**يَا ابْنَ البَشَر قَدَّرْتُ لَكَ مِنَ الشَّجَر اللأَبْهى الْفَواكهَ الأَصْفى كَيفَ أعْرَضْتَ عَنْهُ و رَضيتَ بِالَّذي هُوَ أدْنَى فَارْجعْ إلى ما هُوَ خَيرٌ لَكَ فِي الأُفقِ الأعْلَى**

واتای بەیانەکە ئەوەیە کە:

ئەی کوڕی ئینسان، لە داری (ابهی)، میوەی خۆش و ناسك و درەوشاوەم بۆ دابینکردی. چۆن ڕووت لێ وەرگێڕا و بە شتێك ڕازی بووی کە زۆر سووکتر و نزمترە؟ کەواتە بگەڕێوە بەرەو ئەوەی لە ئاسۆی بەرزدا بۆ تۆ باشترین شتە.

هەروەها دەفەرموێ:

**يَا إبْنَ الرُّوح خَلَقْتُكَ عَالياً، جَعَلْتَ نَفْسَكَ دانيَةً، فَاصْعَدْ إِلى ما خُلِقتَ لَهُ**

ناوەڕۆکی بابەتەکە ئەوەیە کە ئەی کوڕی رووح، تۆم پایەبەرز و بەڕێز خوڵقاند کەچی تۆ خۆت نزم و زەلیل کرد. کەواتە بۆ بەرز بفڕە بەرەو ئەوەی بۆی خوڵقاوی.

ئەو مرۆڤەی کە ئاوەها شەریف خوڵقاوە و شیاوی گەورەیی و ڕێزی

بێ کۆتاییە، هەندێك جار خۆی وەها زەلیل دەکات کە جێی شەرم و سەرسووڕمانە. بەکارهێنانی مادە سڕکەرەکان کە عەقڵ و هۆشیاریی مرۆڤ دەخاتە ژێر ڕکێفەوە و لەوپەڕی بەرزی و گەورەییەوە بۆ قووڵایی نزمی و نابووتی دەیبات، لە ئایینی بەهاییدا نەهی لێکراوە. هەروەها خواردنەوە کحوولییەکانیش کە یەکێك لە گەورەترین نەخۆشییە کۆمەڵایەتییەکانە، لە ئایینی بەهاییدا قەدەغەکراوە. خواردنەوەی مادە کحولییەکان، لە لایەکەوە زەینی کەس و هزری دەخاتە ژێر کاریگەرییەوە و لە لایەکی دیکەوە تەندروستیی بنەماڵە و کۆمەڵگە دەخاتە مەترسیەوە.

یەکێکی دیکە لە حوکمەکانی حەزرەتی بەهائوڵڵا سەبارەت بە پەروەردە و بارهێنانی منداڵان و ئەرکی دایك و باوکە لەمبارەیەوە. حەزرەتی عەبدولبەها دەفەرموێ:

**پەروەردەکردن لە گەورەترین فەرمانەکانی خوای بێ هاوتایە و کاریگەریەکەی، وەك کاریگەریی هەتاوە لەسەر دار و بەر. پێویستە زۆر چاودێری و پارێزگاریی منداڵان بکرێت و پەروەردە بکرێن. ئەمەیە حەقیقەت و میهرەبانیی دایك و باوك، ئەگەر وەها نەکەن، دەبنە هەرزە گیا و داری زەقوم. خێر و شەڕ نازانن و چاکە و خراپە لێك ناکەنەوە.**

هەروەك چۆن تیشکی خۆر دەبێتە هۆی گەشەکردنی دار و بەر و میوەکەی بە تینی خۆر دەگات و بەتام دەبێت، منداڵانیش بەهۆی پەروەردەوە، گەشە دەکەن _هەڵبەت ئەم گەشەکردنە دەکرێ لە بواری جەستەیی و مرۆیی و رووحانییەوە بێت_ چاك و خراپ لێك دەکەنەوە و سیفەتە باشەکان لە ئەخلاقی نەشیاو جیا دەکەنەوە و خوازیاری دەبن.

لە بەیانێکی دیکەدا حەزرەتی عەبدولبەها دەفەرموێ:

**منداڵان وەك لق و پۆپی تەڕ و نوێ وان. هەر چۆنێکیان بار بهێنی گەشە دەکەن. کەواتە بۆ بەرزیی منداڵان زۆر هەوڵ بدەن بە چەشنێك کە گەیشتنە تەمەنی باڵغبوون، وەك مۆم داگیرسێن و تووشی هەوا و هەوەس نەبن کە شێوازی ئاژەڵی نەزانە، بەڵکوو بیر لە سەربەرزیی ئەبەدی و فێربوون و وەرگرتنی چاکەکانی جیهانی مرۆیی بکەنەوە.**

منداڵ پڕبەهاترین سەرمایەی هەر کۆمەڵگەیەکە. گەر بە چەشنێك پەروەردەبکرێن کە ئاوات و خەونەکانیان خزمەت بە خەڵك و خۆشویستنی مرۆۋ بێت، داهاتوویەکی زۆر ڕوون و گەش چاوەڕوانی ئەو کۆمەڵگەیە دەکات.

مەبەستی سەرەکیی ئاشکرابوونی حەزرەتی بەهائوڵڵا، ئەفراندنی کەسانی نوێیە کە ئاوێنەی باڵانوێنی سیفەتە بەرزەکانی خوا بن. ئەم سیفەتانە وەها شکۆمەند و گەورەن کە هەنووکە، ئەگەری وێنا کردنیان نییە.

## بەشی هەژدەیەم

# شارستانییەتی رووحانیی جیهانی

ئایینی بەهایی تەنیا بریتی نییە لە کۆمەڵێك یۆتۆپیای جوان، بەڵکوو ئایینێکی رێکخراو و لێکگرێدراوە کە ئامانجی، دامەزراندنی شارستانییەتێکی رووحانیی جیهانییە.

یارمەتیی بەهاییەکانی جیهان بۆ خەڵکانی تری جیهان بۆ بناغە دانانی ئەم شارستانییەتە لە رێگای هاوئاهەنگکردنی چالاکی و بەرپرسیارێتیی سێ جۆر بەشدار بوو پێشکەش دەکات. یەکەمین بەشدار بوو، تاکەی بەهاییەکانن. تاکی بەهایی لەم رێگەیەدا، بەردەوام پەیمانەکەی لەگەڵ خوا لەبەرچاوە و رۆژانە هەوڵ دەدات ژیانی خۆی بخاتە سەر رێگەی ئامۆژگاریەکانی حەزرەتی بەهائوڵڵا. ئەو لەم راستیە ئاگادارە کە ژیان بە مەرگ کۆتایی نایەت. پەیوەندیی تاك و خوا ئەبەدییە و پاش مردن رووح ئازاد دەبێت و بەردەوام لە خوا نزیك و نزیکتر دەبێتەوە.

ئەو دەزانێ کە ژیان لەم جیهانەدا وەك ژیانی کۆرپەلەیە لە منداڵدانی دایك. ٩ مانگ لە شوێنێکی بچووك و داخراو و تاریکدا سەرقاڵی وەرگرتنی توانا و گەشەکردنی ئەندامەکانی لەشیەتی کە لەو شوێنەدا ناتوانێ هیچ کامەیان

بەکاربهێنێت. بەڵام لەگەڵ هاتنە سەر ئەم جیهانە هەموو ئەو هێز و ئەندامانە بەکاردەهێنێت کە لەوێ وەدەستی هێناون. تاکی بەهایی ئەم چەمکە لە پەیوەند لەگەڵ جیهانی دوای مردن فێر دەبێت. ئەو لەم جیهانەدا، هەندێك توانا بەدەست دەهێنێت کە لە جیهانەکانی دیکەدا پێویستی پێیەتی. ئەو فێر دەبێت کە چۆن خۆشەویستی بکات، چۆن فیداکار و لەخۆبووردوو بێت، خزمەتی خەڵك بکات، لە خەڵکەوە فێر بێت، لەگەڵ هەموو مرۆڤەکان میهرەبان بێت و لە بنیاتنانی شارستانییەتدا هاوکارییان بکات، لە خەونەکانی خۆی دەست هەڵگرێت و لە واتای فیداکاری تێبگات. ئەو لەم ڕێگەیەدا ئەوەی فێری دەبێت، لەگەڵ خەڵك بەشی دەکات.

دووهەمین بەشداربوو کۆمەڵگەیە. مرۆڤ لەدایك نەبووە تا بە تەنیایی بژیێت. ئێمە لە کۆمەڵگەدا دەژین و دەبێ لەگەڵ هەموان کار بکەین تا شارستانییەتێکی نوێ دروست بکەین.

نزیکترین کۆمەڵگە بۆ هەر تاکێکی بەهایی، کۆمەڵگەی گەڕەکە. لە کۆمەڵگەی گەڕەکدا، ئێمە فێردەبین کە چۆن پێکەوە کاربکەین. چۆن پێکەوە پێشکەوین و چۆن پێکەوە یەکگرتووبین. چۆن دەرگایماڵەکانمان بۆ خوازیارانی حەقیقەت بکەینەوە و چۆن لە بنیاتنانی ئەم شارستانییەتە روحانییە جیهانییەدا، لەگەڵ ڕێکخراوە ئایینی و مەدەنی و دەوڵەتییەکانی دیکەدا هاوکار بین.

تاکی بەهایی وێڕای ئەوەی ئەندامی کۆمەڵگەی گەڕەکە، ئەندامی کۆمەڵگەی میللی خۆی و کۆمەڵگەی جیهانیی بەهاییە. ئەم کۆمەڵگەیە بەردەوام لە

حاڵی گەشە و پێشکەوتندایە و هەموو ڕۆژێك سەدان خوازیاری حەقیقەت لە ئایین و فەرهەنگ و ڕەگەزی جۆراوجۆرەوە بەرەو خۆی ڕادەکێشێت و هاوکاری لەگەڵ خەڵکی دیکە لە ئاستی گەڕەك و میللی و نێونەتەوەییدا پەرە پێدەدات.

بەڵام بەشداربووی سێهەم کە لە یارمەتیدان بۆ بنیاتنانی ئەم شارستانییەتە یەکگرتووە جیهانییەدا ڕۆڵی هەیە، دامەزراوە بەهاییەکانە. بەرزترین دامەزراوەی بەهایی، (خانەی دادی گەورەی خودایی)ە کە ٩ ئەندامی هەیە و هەموو ٥ ساڵ جارێك لە نێوان بەهاییەکانی هەموو جیهانەوە هەڵدەبژێردرێن. بەهاییەکانی هەر وڵاتێك ساڵی جارێك، ٢ دامەزراوەی دیکە واتە کۆڕی نەتەوەیی و کۆڕی ناوچەیی خۆیان هەڵدەبژێرن. لە ئایینی بەهاییدا هیچ مەلا یان قەشەیەك نییە و ئەم کۆڕە رووحانیانەن کە کارەکانی کۆمەڵگەی شار یان گوند و یان وڵات ڕێنوێنی و بەڕێوە دەبەن و پاراستن و تەندروستیی کۆمەڵگە دەستەبەر دەکەن.

کۆڕی روحانیی میللی و ناوچەیی لە ٩ ئەندام پێك دێت کە لە کەشێکی روحانیدا بە دەنگی شاراوە و لە لایەن هەموو بەهاییە باڵغبووەکانی کۆمەڵگەوە و لە هەمواندا (بە بێ دیاریکردن یان پاڵاوتن) هەڵدەبژێردرێن. کۆڕە روحانییە میللی و ناوچەییەکان بایەخێکی زۆریان بۆ بەهاییەکان هەیە. لە ڕێگەی ئەوانەوەیە کە ئێمە دەزانین کارەکانمان دەبێ چۆن بەڕێوە ببرێت و چۆن سیستم و ڕێکوپێکی لە کۆمەڵدا پێ دەگرێت. سیستمێك کە بە سیستمی نوێی جیهانیی حەزرەتی بەهائوڵڵا ناسراوە.

کۆمەڵگەی شوێنکەوتوانی حەزرەتی بەهائوڵڵا کە بە باوەڕی هاوبەش، بە پەیوەندیی زۆر پتەوی عەشق و خۆشەویستیی حەزرەتی بەهائوڵڵا پێکەوە گرێدراوە، لایەنی جۆراوجۆر و هاوئاهەنگی هەیە کە لە گەیشتن بە ئامانجە زۆر بەرزەکەیدا یارمەتیدەرە.

یەکێك لە لایەنە بنچینەییەکانی ئەم کۆمەڵگەیە، خۆشەویستی و هاوڕێیەتی خۆشەویستانە و عاشقانەیە. لایەنێکی دیکە ئەوکاتەیە کە ئیمانداران بۆ بەندەیی خوا کۆدەبنەوە و یان لە کۆبوونەوەکانی خۆیاندا ئەوەی لە ئامۆژگاریەکانی حەزرەتی بەهائوڵڵا تێگەیشتوون، بۆ یەکتری دەڵێنەوە و بەردەوام زانیاری و زانستی خۆیان سەبارەت بە بەیانەکانی حەزرەتی بەهائوڵڵا پەرە پێدەدەن. لە لایەنەکانی دیکەی ئەم کۆمەڵگەیە، خزمەتکردنی خەڵکی جیهانە. هەر کەسێك بە هەر پێشینەیەکەوە، کاتێك بە دڵ هەستیکرد کە دەتوانێ بێتە ناو ئەم کۆمەڵگەیە لێك ئاڵاوە_ کە دەرگاکانی هەمیشە کراوەیە_ و بۆ بنیاتنانی ئەم شارستانییەتە روحانییە جیهانییە، پێ بە پێی خەڵکی دیکە بڕوات، بەم کۆمەڵەیەوە دەبەسترێتەوە. لەم کۆمەڵەیەدا، دامەزراوە و رێکخراوگەلێك هەن کە کاروباری کۆمەڵگە بەڕێوەدەبەن، ئیمکانیاتی پەروەردە و بارهێنانی روحیی مندالانی کۆمەڵگە دابیندەکەن، ناکۆکیەکانی نێوان تاکەکان چارەسەردەکەن و دوای کۆچی هەر کام لە ئەندامانی کۆمەڵگە، ڕێوڕەسمی بەخاکسپاردنی شیاو و کۆبوونەوەی دوعاکردن بۆ بەرز بوونەوەی رووحی کۆچکردوو بەڕێوە دەبەن.

بەرچاوترین لایەنی وەها کۆمەڵگەیەك ئەوەیە کە پێکەوە و یەکگرتووانە لە پێناو سەقامگیربوون و یەکێتیی جیهانی مرۆیی هەوڵدەدەن.

لایەنەکانی دیکەی ئەم ئایینەش دەتوانین یەك لە دوای یەك باسبکەین. ئامۆژگاریی جوان کە پەیوەندیی بە ژیانی ئەم جیهانەوە هەیە، یەکسانی مافەکانی ژن و پیاو، ئاشتیی گشتی، زاڵبوون بەسەر دەمارگرژیدا، پشتبەستن بە ڕاوێژ و پرس و ڕا، تەحەمول و خۆڕاگری... بەڵام ئەگەر چەمکێك لەبەرچاو نەگرین، **هیچکات** پێناسەمان بۆ ئایینی بەهایی پێناسەیەکی گشتگیر و تەواو نابێت.

کۆمەڵی بەهایی کۆمەڵگەیەکە سەرقاڵی خزمەتکردنی خەڵکی جیهانە. هەزاران هەزار ڕێکخراو لە کۆمەڵگەی مرۆییدا هەن کە لە پێناو خزمەتدا هەنگاو دەنێن و هیوادارن کە بارودۆخی کۆمەڵایەتی باشتربکەن. حەزرەتی بەهائوڵڵا دەفەرموویت: **هێشتا زووە ئەم جیهانە لێك هەڵپێچڕێت و شتێکی دیکە پان بکرێتەوە**، یاوەڕبوونمان بەو بەیانە بەو مانایەیە کە ئاسوودەیی و خۆشیی کۆمەڵگەی مرۆیی لە سەقامگیربوونی سیستمی نوێی خوایی و جیهانیی حەزرەتی بەهائوڵڵادا دەبینین.

ئێمە خۆمان بەم هزرەوە فریو نادەین کە جیهان کەم و زۆر باش و ڕێکە. تەنانەت ئەگەر ژیانێکی تا ڕاددەیك ئاسوودەش بژین، پێمان وانییە کە ستەم بەسەر جیهاندا دەسەڵاتی نییە و ئێرەیی و چاوتێبڕین، ژیانی ملیۆنان مرۆڤ لەناو نابات. بە هەموو ئەمانەشەوە کۆمەڵگەی بەهایی ڕاپەڕینێکی شۆڕشگێڕانە، بە واتای سیاسیی باوی ئەمڕۆ نییە.

ڕاستە باوەڕمان بەوە هەیە کە سیستمەکانی ئێستای جیهان بەگشتی ناتەواو و ناڕێکن، بەڵام هیچ کات هەوڵ نادەین کە ئەم سیستمانە لەناوبەرین

و بیرووخێنین. ئێمە بنیاتنەرانی سیستمی نوێ و جیهانی لە ئاستێکی گشتیداین و حەز ناکەین ڕەفتار و بیرکردنەوەی کەسانی وێرانگەر، پەرەپێبدەین و بەهێزی بکەین.

ئێمە بە هێزی یەکبوون، هێزی کرداری پاك و بە هێزی خزمەتی ڕاستگۆیانە و بێلایەنانە و هێزی پشتگیریی خوایی باوەڕمەندین. گەورەترین ئاواتی دڵ و دەروونمان، خزمەتکردنە. ئێمە خزمەت بە بەرژەوەندیەکانی جیهانی مرۆڤ و بە هەموو مرۆڤایەتی دەکەین. ئێمە هاوکاری لەگەڵ هەر پڕۆژەیەك دەکەین کە تەنانەت بچووکترین خزمەت بە چاکسازیی جیهان بکات. بەڵام نەخشەی گەورەی ئێمە، پەیوەندیی هەیە بە بنیاتنانی شارستانییەتێکی تەواو نوێ، شارستانییەتێك کە مرۆڤ تا ئێستا هاوشێوەی نەبینیوە و بە مێشکی کەس نەگەیشتووە. ئەمە ئەو کۆمەڵگەیەیە کە حەزرەتی بەهائوڵلا لەم ڕۆژە پیرۆزەدا بۆ خزمەت بە جیهان، خوڵقاندوویەتی.

# میهر و خۆشەویستی و ڕێککەوتن و یەکگرتوویی

ئەی دانیشتوانی جیهان، دەرکەوتنی خۆری حەقیقەت بۆ ڕووناکایی جیهانە و ئاشکرابوونی بەخشندەیی لە ناو مرۆڤدا بەرهەمی پەسندکراو و بەرەکەتی پیرۆزە، هەر بەخششێکی لە ڕادەبەدەر، بەخشندەیی و ڕەحمەتی تەواوە و پاداشتێکی تەواوە، و ڕووناکیی جیهان و دانیشتوانەکەی لە هاوپەیمانی و یەکگرتنە و خۆشەویستی و پەیوەندیی، بەخشندەیی و یەکبوون و سڕینەوەی بێگانەیی و یەکگرتن لەگەڵ هەموو دانیشتوانی گۆی زەوی لەوپەڕی زانایی و ئازادیدا، دەفەرمویٚ هەموو بەری دارێکن و گەڵای لقێکن، هەموو بوون بە دارێك و هەموو خەڵك بە گەڵا و شکۆفە و بەر دەشوبهێنیٚ. کەواتە خۆشەویستانی خوا دەبێ لە جیهاندا ببنە ڕەحمەتی خوای خۆشەویست و بەخششی پاشای پاشاکانی دیار و نادیار بە گوناه و سەرپێچی سەیر نەکەن و لە ستەم و دوژمنایەتی نەڕوانن، دیدە پاك بکەنەوە و مرۆڤ هەموو وەك گەڵا و شکۆفە و بەری داری بوون ببینن. بەردەوام بیر لەوە بکەنەوە کە چاکەیەك بە کەسێك بگەیەنن و خۆشەویستی و پاراستن و دۆستایەتی و یارمەتیی کەسێك بدەن، کەس بە دوژمن و بەدخواز نەبینن. هەموو دانیشتوانی زەوی بە دۆست بژمێرن و غەیر بە یار دابنێن و بە بێگانە ئاشنابن و پابەندی هیچ بەندێك نەبن، بەڵکوو لە هەموو بەندێك ڕزگاریان بێت.

ئەمرۆ ئەو کەسە لە بارەگای خوا نزیکە کە وەفادار بێت و مرواریی بەخشش و لێبوردن بە دوژمنەکان ببەخشێ، تەنانەت دەستی ستەمکاری چارەڕەش بگرێت و بۆ دوژمنی پەشیمان ببنە یاری میهرەبان. ئەمەیە وەسیەتی حەزرەت، ئەمەیە ئامۆژگاریەکانی ناوی پیرۆز.



ئەی دۆستان وەك چرا بن بۆ جیهانی تاریکی و وەك تیشك بن بۆ تاریکی، لەگەڵ هەموو خەڵکی جیهان بەوپەڕی خۆشەویستییەوە ڕەفتار بکەن. دوور کەوتنەوە و ململانێ و گەندەڵی بە تەواوی لەم دەرکەوتنە گەورەیەدا قەدەغە کراوە.



لەگەڵ هەموو جیهان بە خۆشی و شادیەوە هەڵسوکەوت بکەن، چونکە هاتوچۆ کردن هۆی یەککگرتن و یەکبوون بووە و هەیە و یەککگرتوویی و یەکبوون هۆکاری سیستمی جیهان و ژیانی هەموانە. داری تووبا بۆ ئەوانەیە کە بە خۆشەویستی و میهرەبانی ماون و لە نەفرەت و دوژمنایەتییەوە بە دوورن.

# خێرخوازی و یارمەتیدانی خەڵك

ئەی دۆستانی خۆشەویست، جیهان لە شەڕ و ململانێدایە و مرۆڤ لەوپەڕی دوژمنایەتی و باڵی ئازاری تاریکیی جەفا زاڵ بووە و تیشکی وەفا و خۆشەویستی نادیارە. هەموو نەتەوە و هۆزەکانی جیهان ددانیان لێك تیژ کردووە و پێکەوە بە شەڕ دێن. بنچینەی مرۆڤ ژێر و ژوور بووە، هەزاران خێزان بێ سەر و سامانە. هەموو ساڵێك هەزاران هەزار کەس لە گۆڕەپانی شەڕ و پێکداندا لە خاك و خوێن دەگەوزێن و خێوەتی بەختەوەری و ژیان ڕوخاو و وەرگەڕاوە. سەروەرەکان سەرداری دەکەن و شانازی بە خوێنڕشتنەوە دەکەن و بە فیتنەیی و شەڕ هەڵایساندن دەنازن. یەکێك دەڵێ من شمشێرم بۆ پاراستنی گەلێك هەڵکێشاوە و ئەویتر دەڵێ وڵاتێکم وێران کرد و یەکێك دەڵێت دەوڵەتێکم ڕووخاند. ئەمەیە بازنەی سەروەری و پێنازینی مرۆڤ. لە هەموو لایەك دۆستایەتی و ڕاستگۆیی بە خراپە باس دەکرێت و ئاشتی و حەقپەرستی وەبەر تانە و تەشەر دەدرێت. بانگەشەکاری ئاشتی و تەبایی و خۆشەویستی و ئاسوودەیی، ئایینی پیرۆزی حەزرەتە کە لە سەنتەری بووندا وەستاوە و هەمووان بانگهێشت دەکات. کەواتە ئەی یارانی خوا ڕێزی ئەم ئایینە بگرن و بەپێی ئەو هەڵسوکەوت بکەن و لە ڕێگەی ڕاست و ڕێبازی باشدا هەنگاو بنێن و بە خەڵکیشی نیشان بدەن. ئاوازی ئاسمانی بچڕن و ئامۆژگاری و

فەرموودەکانی خوای خۆشەویست بڵاوبکەنەوە، تا جیهان ببێتە جیهانێکی دیکە و دنیای تاریکی ڕووناك ببێتەوە و تەرمی مردووی خەڵك ژیانی تازە بگرێت. هەرکەسێك لە خوای بەخشندە، ژیانی هەرمان بخوازێت. ئەم ژیانەی جیهانی فانی لە کورت ماوەدا کۆتایی دێت و ئەم گەورەیی و سامان و ئاسوودەیی و خۆشییەی سەرزەوی بە زوویی لەناودەچێت. خەڵك بەرەو خوا بانگهێشت بکەن و تاکەکان بەرەو ڕێباز و شێوازی (ملأ اعلی) بانگهێشت بکەن. بۆ هەتیوان ببنە باوکی میهرەبان و بۆ داماوان پشت و پەنا. بۆ هەژاران ببنە خەزێنە و بۆ نەخۆشان دەرمان و شیفا. یارمەتیدەری هەر ستەملێکراوێك بن و پەنا بەخشی هەر بێبەشێك. بیر لەوە بکەنەوە کە خزمەت بە هەموو تاکێکی مرۆڤ بکەن و گوێ مەدەنە ناسیا و نەناسیاو و گەورە و بچووك و ستەم و دوژمنایەتی بەها پێمەدەن، بەڵکوو بە پێچەوانەوە ڕەفتار بکەن و بەڕاستی میهرەبان بن نەك بە ڕواڵەت و ڕووکەش. هەر کەسێك لە خۆشەویستانی خوا دەبێ بیری بۆ ئەوە تەرخان بکات کە ڕەحمەتی خوا بێت و بەخشندەیی بە هەر کەسێك بگات چاکەیەك بکات و قازانجێکی پێ بگەیەنێت و ببێتە هۆی باشبوونی ئەخلاق و هێوربوونەوەی هزرەکانی، هەتا تیشکی هیدایەت دەرکەوێ و بەخششی خواوەندیی بیتەنێت. خۆشەویستی تیشکە لە هەر ماڵێك بدرەوشێتەوە و دوژمنایەتی تاریکە لە هەر شوێنێك بارگە بخات. ئەی خۆشەویستانی خوا هەوڵێك بدەن کە ئەم تاریکییە بە تەواوی بسڕێتەوە، هەتا نهێنی ئاشکرا بێت و ڕاستیەکان ئاشکرا بن.

# خزمەت بە مرۆڤایەتی

مرۆڤ بۆ چاکسازیی جیهان هاتووە و دەبێ لەبەر خوا دەست بداتە خزمەتکردنی براکانی.



ئەمڕۆ مرۆڤ ئەو کەسەیە کە خزمەتی هەموو دانیشتوانی زەوی بکات.



من ئامۆژگاریەکتان دەکەم کە هەتا دەتوانن لە پێناو چاکە و قازانجی گشتیدا هەوڵ بدەن و خۆشەویستی و نزیکایەتی لەوپەڕی پاکیدا بە هەموو مرۆڤ نیشان بدەن.



ئێوە هەموو دەبێ پەنا ببەنە بەر هۆکارەکانی ئاسوودەیی و ئاسایشی جیهانی مرۆڤ. دڵنەوایی هەتیوان بدەنەوە، برسی تێربکەن، ڕووت و ڕەجاڵ پۆشتە بکەن، یارمەتیی لێقەوماوان بدەن هەتا لە بارەگای خوای گەورە وەرگیرێن.



بۆ هەر ستەملێکراوێك پشت و پەنا بن و دەستگیرۆیی شکستخواردووان بکەن و داڵدەی توانایان بدەن. بۆ هەر نەخۆشێك پزیشکێکی لێهاتوو بن و بۆ هەر برنیدارێك مەرهەمی باش. بۆ هەر ترساوێك ببنە پەنای پارێزراو و بۆ هەر نائارامیەك ببنە هۆی ئارامی و حەسانەوە. خەفەتباران شاد بکەن و خەندە بێننە سەر لێوی چاو بە فرمێسکان. تینوویان تێراو بکەن و بۆ برسیان ببنە خوانی ئاسمانی. بۆ زەلیل و داماوان ببنە هۆی سەربەرزی و بۆ هەژاران ببنە نیعمەت و فراوانی.



# پلەوپایەی ژن

لە ئامۆژگاری و پەروەردەکانی حەزرەتی بەهائولڵا، یەکێتیی ژن و پیاوە کە جیهانی مرۆڤایەتی دوو باڵی هەیە، باڵێك پیاوان و باڵێك ژنانن. هەتا دوو باڵ وەك یەك و یەکسان نەبن، مەل نافڕێ. ئەگەر باڵێك لاواز بێت، فڕین هیچ ئەگەری نییە. هەتا جیهانی ژنان لەگەڵ پیاوان یەکسان نەبێت بۆ فێربوون و وەرگرتنی زانست و کەمالات و فەزیلەت، ڕزگاری و ئازادی بەوجۆرەی کە شیاوە و دەبێ، وەدی نایەت.



ژن و پیاو هەر دوو مرۆڤن و بەندەی خوایەکن. لای خوا نێر و مێ بوونی نیە. ئەوەی دڵی پاکترە و کردەی باشتر، لە خواوەند نزیکترە، جا چ پیاو بێت یان ژن. ئەم جیاوازیەی ئێستا هەیە، لە جیاوازیی پەروەردەوەیە. چونکە ژنان وەك پیاوان پەروەردە ناکرێن. ئەگەر وەك پیاوان پەروەردە بکرێن، لە هەموو بوارەکاندا یەکسان دەبن، چونکە هەر دوو مرۆڤن و لە هەموو پلە و بوارە هاوبەشەکاندا، خوا هیچ جیاوازیەکی ڕەوا نەبینیوە.



**... و هەروەها یەکبوونی مرۆڤی ڕاگەیاند کە ژن و پیاو هەمووان لە مافەکاندا یەکسانن و هیچ ئیمتیازێك لە نێوانیاندا نییە، چونکە هەموو مرۆڤن و تەنیا پێویستییان بە پەروەردەیە. ئەگەر ژنان وەك پیاوان پەروەردە بکرێن، بێ‌گومان هیچ ئیمتیازێك نامێنێت. چونکە جیهانی مرۆیی وەك باڵندە پێویستی بەو دوو باڵە، یەکیان مێیینە و ئەویتریان نێرینە. مەل ناتوانێت بە باڵێك بفڕێت، ناتەواویی باڵێك دەبێتە هۆی ئازار و ناتەواویی باڵەکەی دیکە.**



**... هەتا یەکسانیی تەواو لە نێوان نێر و مێ لە مافەکاندا ڕەچاو نەکرێت، جیهانی مرۆیی پێشکەوتنی ئەوتۆ نابینێت. ژنان کۆڵەگەی گرنگن لە دوو کۆڵەگە گەورەکە و یەکەمین مامۆستا و پەروەردەکاری مرۆڤ. چونکە ئەوە دایکانن کە مامۆستای منداڵانن. ئەوان بناغەی ئەخلاق دادەنێن و منداڵان پەروەردە دەکەن.**



**پەروەردەکردنی ژنان لە پەروەردەکردنی پیاوان گرنگترە چونکە ئەگەر ژنان پەروەردە بکرێن، منداڵانیش لە ژیانێکی رووحانیدا گەشەدەکەن. بۆ وێنە ئەگەر دایکێك لە کاری بانگەشەی امر الله فێری بەڵگە و هۆکار و باسەکان بێت، هەموو منداڵەکانیشی لەسەر ئەوە پەروەردە دەکات.**



**لە سەردەمی کۆندا جیهان بە زۆر بەڕێوە دەبرا و پیاو چونکە بە جەستە و بە فکر لە ژن بەهێزتر و هێرشبەرتر بوو، بەسەریدا زاڵ بوو، بەڵام ئێستا دۆخەکە لە گۆڕاندایە. وردە وردە زۆرویژی و توورەیی، باڵادەستی خۆی لەدەستدەدا و هۆشیاری، زیرەکی و تایبەتمەندیی رووحانیی خۆشەویستی و خزمەت کە لە ژندا بەهێزە، سەردەکەوێ و زاڵ دەبێت.**



**ئازادیی ژنان و گەیشتن بە یەکسانیی نێوان ژن و پیاو، ئەگەرچی هێشتا وەك شیاو بەها و بایەخی ئاشکرا نەبووە، یەکێك لە گرنگترین ئامرازەکانی وەدیهاتنی ئاشتیی جیهانییە. نکۆڵیکردن لە یەکسانیی نێوان ژن و پیاو، دەرەنجامەکەی دەبێتە ستەمکردن لە نیوەی دانیشتوانی جیهان و وەها عادەت و رەفتارێکی نەشیاو لە پیاواندا پێك دەهێنێت کە ئاسەوارە خراپەکانی لە ناو ماڵەوە بۆ شوێنی کار و ژیانی سیاسی و تەنانەت بۆ پەیوەندیی نێودەوڵەتیش دەکێشرێت. حاشاکردن لە یەکسانیی ژن و پیاو هیچ مۆڵەت و پاساوێکی ئەخلاقی و کردەی و سروشتی نییە، تەنیا کاتێك کە ژنان لە هەموو بوارەکاندا بەشی تەواو و یەکسانیان هەبێت، لە ڕووی ئەخلاقی و دەروونییەوە کەشێکی لەبار دەخولقێت کە تێیدا بەرەبەیانی ئاشتیی جیهانی سپێدە دەدات.**



# پێویستی پەروەردە و بارهێنان و ئەخلاق

**مرۆڤەکان وەك کانەبەرد، تاشەبەردی گەورەیان تێدایە، سەیربکە بە پەروەردە کردنی گەوهەرەکەی دێتە بوون و جیهانی مرۆڤایەتی پێی سوودمەند دەبێت.**



پەروەردە و بارهێنان، واتە فێرکردن و ڕێنماییکردنی تاکەکان و گەشە و پەروەردەی هێزە دەروونی و سروشتییەکانی مرۆڤ، بەردەوام ئامانجی بەرزی پێغەمبەرانی گەورە بووە هەر لە سەرەتای دروستبوونی جیهانەوە، لە پەروەردەکانی بەهاییدا بە ڕوونترین شێوە بایەخی بنەڕەتیی و دەرفەتە بێکۆتاییەکانی پەروەردە و بارهێنان ڕوونکراوەتەوە. لە جیهانی شارستانیەتدا مامۆستا بەهێزترین هۆکارە و پیشەی مامۆستایی بەرزترین پلەیە کە کەسێك بتوانێ بە ئاواتی بخوازێت. پەروەردە هەر لە منداڵدانی دایکەوە دەست پێدەکات و هەتا کۆتایی تەمەن درێژەی هەیە و لە پێداویستییە گرنگەکانی ژیانی ڕاستەقینە و بناغەی بەختەوەریی تاك و کۆمەڵە. ئەگەر پەروەردە و بارهێنان بە شێوازێکی دروست گشتگیر بێتەوە، جیهانی مرۆیی دەگۆڕێت و جیهان دەبێتە بەهەشتی بەرین. هەنووکە کەسێك کە بە ڕاستی باش پەروەردەکرابێت زۆر کەم و نایابە، چونکە دەتوانین بڵێین کە هەموان

هەڵگری کۆمەڵێك دەمارگرژیی ناڕەوا و مەرام و خەونی نادروست و بۆچوونی بەتاڵ و خو و خدەی سووکن کە هەر لە منداڵییەوە لەگەڵی گەورە بوون. زۆر کەمن ئەوانەی کە هەر لە تەمەنی کەمەوە بە هەموو دڵەوە وانەی خۆشەویستیی خوا فێر بووبێتن و تەمەنی خۆیانی بۆ تەرخان بکەن و خزمەت بە مرۆڤ بکەنە باڵاترین ئامانجی ژیانیان و هێز و تواناکانیان بۆ بەختەوەریی و چاکەی گشتی تەیار بکەن. ئەمە لە حاڵێکدا کە بە بێگومان و بە دڵنیاییەوە بناغەی پەروەردە و بارهێنانی دروست و بەجێ هەر ئەم شتانەیە کە باسکران و تەنیا پڕکردنی مێشك بە یاساکانی ماتماتیك و سەرف و نەحو و جوگرافیا و زمانە بیانییەکان و هتد کاریگەریەکی نیە لەسەر بەرهەمهێنانی کەسایەتی گەورە و سوودمەند بۆ کۆمەڵگا.



... ئامۆژگاریی هەشتەمی حەزرەتی بەهائوڵڵا: پەروەردەی گشتی پێویستە و یەکێتیی بنەماکان و یاساکانی پەروەردەکردنیش لە گرنگترین کارەکانە هەتا هەموو مرۆڤ وەکیەك پەروەردە بکرێن. واتە پەروەردە و بارهێنان دەبێ لە هەموو خوێندنگاکاندا یەکسان بێت. بنەما و نەریت هەموو یەك بنەما و نەریت بێت، بۆ ئەوەی ئەمە ببێتە هۆی ئەوەی یەکێتیی جیهانی مرۆڤ هەر لە تەمەنی کەمەوە لە دڵی هەمواندا جێگیر بێت.



پەروەردە و بارهێنانی گشتی کە هەنووکە سوپایەك لە خەڵکی خاوەن بەڵێنی لە هەموو ئایین و وڵاتەکانەوە کۆکردووەتەوە و خستوویەتە خزمەتی خۆی، دەبێ لە

لایەن دەستەڵاتەکانی جیهانەوە پشتیوانی لێبکرێت، چونکە بێگومان نەزانی هۆکاری سەرەکیی دارِمان و دواکەوتوویی خەڵك و مانەوەی دەمارگرژیە. هیچ وڵاتێك سەرناکەوێت مەگەر ئەوەی کە هەموو خەڵکەکەی لە پەروەردە و بارهێناندا بەشداربن. نەبوونی ئەو سەرچاوانەی کە هێز و دەسەڵاتی وڵاتان لە رێگای پەروەردە و بارهێنانی گشتیدا بەرتەسك دەکاتەوە، دەبێ دەستەڵاتداران هان بدات کە ژنان بخەنە رِیزی پێشەوەی پەروەردەکردن، چونکە لە رِێگای دایکانی خوێندەوار و پەروەردەکراوەوەیە کە بەرهەمی زانست و خوێندن بە خێرایی و بەدڵنیاییەوە لە هەموو کۆمەڵگەی مرۆییدا بڵاو دەکرێتەوە. خاڵی گرنگی دیکە ئەوەیە کە لەم بابەتەدا دەبێ ئەوە لەبەرچاوبگرین کە خواستی سەردەم وایە کە جیهان دۆستی و چەمکی خەڵکی جیهانبوون بکرێت بە یەکێك لە بنەماکانی پەروەردە بۆ منداڵانی هەموو جیهان.



لەم سەردەمە نوێیەدا پەروەردە و بارهێنان ئەرکێکی زۆرەملێیە نەك دڵخواز. واتە فەرزە لەسەر دایك و باوك کە کچ و کورِ بەوپەڕی هەوڵ و کۆششەوە پەروەردە بکەن و شیری مەمکی عیرفانی پێبدەن و لە باوەشی زانست و مەعریفەدا پەروەردەیان بکەن و ئەگەر لەم بوارەدا کەمتەرخەمی بکەن لای خوای گەورە لێپرسینەوەیان دەبێت و گوناهبار و دەرکراو دەبن و ئەمە گوناهێکە کە لێی خۆش نابن، چونکە ئەو منداڵە داماوە ئاوارەی بیابانی نەزانی دەکەن و بەدبەختی دەکەن و بۆ هەمیشە ئەو منداڵە ستەملێکراوە دیلی دەستی نەزانی و خۆپەرستی و بێ عەقڵی دەبێت.

له ئایینی بەهاییدا فێربوونی زانست و تەکنیك و پیشەسازی و کاری بەسوود، گرنگ و پێویستە. حەزرەتی بەهائوڵا دەفەرموێ:

(زانست وەك باڵە بۆ بوون و وەك پەیژەیە بۆ سەرکەوتن. فێربوونی بۆ هەموان پێویستە بەڵام ئەو زانستانەی کە خەڵکی جیهان لێی سوودمەند بن نەك ئەو زانستانەی کە بە قسە دەست پێبکات و بە قسە کۆتایی بێت. خاوەنانی زانست و پیشەسازی مافی زۆریان بەسەر جیهانەوە هەیە ...لە ڕاستیدا خەزێنە و گەنجینەی ڕاستەقینە بۆ مرۆڤ زانستەکەیەتی و ئەوە مایەی سەربەرزی و نیعمەت و شادی و خۆشی و دڵکراوەیی.)



# نەهێشتنی دەمارگرژی

لە بنەماکانی بەهائولڵا وەلانانی دەمارگرژی نیشتمانی و دەمارگرژیی ئایینی و دەمارگرژیی ڕەگەزی و دەمارگرژیی سیاسییە. چونکە جیهان تووشی نەخۆشیی دەمارگرژیی بووە و ئەم نەخۆشییە قورسەیە کە دەبێتەهۆی لەناوچوون. هەموو ناکۆکی و شەڕ و پێکدادان و خوێنڕشتنەکان هەر لە دەمارگرژیەوە سەرهەڵدەدەن. هەر شەڕێك کە ڕوودەدات و دەیبینین یان لە دەمارگرژیی ئایینیەوەیە یان لە دەمارگرژیی ڕەگەزی یان دەمارگرژیی نیشتمانی یان دەمارگرژیی سیاسی و هەتا ئەم دەمارگرژیانە هەبن، جیهانی مرۆڤایەتی ئاسوودەیی نابینێت.



... لە بۆنی دەمارگرژیی نەزانانە و دوژمنایەتی و نەفرەتی سوك و وەهمی ڕەگەزی و نیشتمانی و ئایینی کە بە تەواوی دژی ئایینی خوا و ویستی ئەوە و هۆی بێبەشبوونی مرۆڤە لە نیعمەتەکانی خوا، بێزار بن و لەم وەهمانە پاك ببنەوە و ئاوێنەی دڵ لە ژەنگی ئەم دەمارگرژیە نەزانانەیە پاك بکەنەوە هەتا بۆ جیهانی مرۆڤ واتە هەموو مرۆڤەکان بە ڕاستی میهرەبان بن و لە هیچ کەسێك لە هەر نەتەوەیەك و هەر ئایین و هەر هۆز و هەر ڕەگەز و هەر نیشتمانێك سڵ

مەکەنەوە، بەڵکوو لەوپەڕی میهرەبانی و دۆستایەتیدا بن، بەڵکوو بە ویستی خوای گەورە، ئاسۆی مرۆڤایەتی لەم هەورە پیسە واتە دەمارگرژیی نەزانانە و نەفرەت و دوژمنایەتی پاك ببێتەوە. ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ ببنە هۆی نزیکایەتی و خۆشەویستیی لە نێوان هەموو نەتەوەکاندا.



ئامۆژگاریتان دەکەم هەتا دەتوانن لە پێناو چاکەی گشتیدا تێبکۆشن و لەگەڵ هەمووان خۆشەویستی و نزیکایەتی بکەن لەوپەڕی پاکیدا، دەمارگرژیی ڕەگەزی و نیشتمانی و ئاینی و سیاسی و بازرگانی و پیشەیی و کشتوکاڵی لەناوبەرن هەتا لە هەموو لایەنێکەوە ئازاد بن و ڕاگری بناغەی یەکێتیی جیهانیی مرۆڤ بن.



دەمارگرژیی ئاینیو دەمارگرژیی ڕەگەزیو دەمارگرژیی سیاسیو دەمارگرژیی ئابووری و دەمارگرژیی نیشتمانی، ڕووخێنەری بناغەی مرۆڤایەتییە. هەتا ئەم دەمارگرژیانە هەبن، جیهانی مرۆڤایەتی ئاسوودەیی نابینێت. ٦ هەزار ساڵە مێژوو باسی جیهانی مرۆڤ دەکات. لەم ٦ هەزار ساڵەدا جیهانی مرۆڤ لە شەڕ و پێکدادان و کوشتن و خوێنخۆری رزگاری نەبوو. لە هەر سەردەمێکدا لە شوێنێك شەڕ بووە و ئەم شەڕە یان هەڵقوڵاوی دەمارگرژیی ئاینی بوو و یان دەمارگرژیی ڕەگەزی و یان بەرهەمی دەمارگرژیی سیاسی و یان لە دەمارگرژیی نیشتمانی. کەواتە سەلمێنرا کە هەموو دەمارگرژیەکان ڕووخێنەری بناغەی مرۆڤایەتین و تا ئەم دەمارگرژیانە هەبن، ململانێ لەپێناو

مانەوە بەردەوامە و خوێنخۆری و دڕندەیی هەر دەمێنێ، کەواتە جیهانی مرۆیی لە تاریکایی سروشت ڕزگاری نابێت و ڕوون نابێتەوە مەگەر بە وەلانانی دەمارگرژی و ڕەچاوکردنی ئەخلاقی ئاسمانی.



# ئاشتی گشتی

ئەو ئاشتییە گشتییەی کە ئاواتی دڵ و گیانی پیاوچاکانی جیهان بووە لە هەموو سەدە و سەردەمێکدا و عارفان و شاعیرەکان نەوە لە دوای نەوە بەردەوام قسەیان لەبارەیەوە کردووە و لە کارگەی خەیاڵدا وێنەیان کێشاوە، ئەو ئاشتییەی کە وەدیهاتنی مژدەی هەموو کتێبە پیرۆزەکان بووە لە هەموو سەردەمێکدا، ئێستا نزیك بووەتەوە لەوەی کە جیهان بە دەستی بهێنێت. ئەمە یەکەمین جارە لە مێژووی جیهاندا کە دەتوانرێ هەموو گۆی زەوی سەرەڕای ناکۆکیی بێژماری خەڵکەکەی وەك گشتێکی یەکپارچە سەیر بکرێت. کەواتە سەقامگیربوونی ئاشتیی جیهانی نەك هەر دەکرێت، بەڵکوو ناکرێ خۆی لێ لابدەین و قۆناغێکی دیکەیە لە گەشە و کامڵبوونی جیهان کە بە وتەی یەکێك لە بیرمەندانی گەورە، قۆناغی بە جیهانی بوونی جیهانی مرۆییە.



**بۆزانیاریی زیاتر لەمەڕ ئایینی بەهایی سەردانی ماڵپەڕی www.bahai.org بکەن.**